لووسی گارنێت



# ئافرەتی کورد لە تورکیا

باری ژیانو پیشەیان ، دابو دەستووری ماڵەوەیان ،
بیروباوەڕیان ، داستانو چیرۆکی فۆلکلۆرییان

بەشێکە لە کتێبی :
« ئافرەتی تورکیاو فۆلکلوریان ، ١٨٩١ ب٢ ل ١١٣-١٨٩ »

عەزیز گەردی

لە ئینگلیزییەوە کردوویە بە کوردی

١٩٨٣

نووسی گارنێت

# ئافرەتی کورد لە تورکیا

بارى ژيانو پيشەيان ، دابو دەستوورى ماڵەوەيان ،
بيروباوەڕيان ، داستانو چيرۆكى فۆلكلۆرىيان

بەشێکە لە کتێبى :
« ئافرەتى توركياو فۆلكلۆريان ، ١٨٩١ ب٢ ل ١١٣-١٨٩ »

عەزیز گەردی

لە ئینگلیزییەوە کردوویە بە کوردی

١٩٨٣

چاپخانەى ئیرشاد - بەغدا

THE WOMEN OF TURKEY

AND THEIR FOLK-LORE

BY :

LUCY, M. J. GARENTT

"PART; III : THE MOSLEM WOMEN—

CHAPS. I,II,III, IV: KURDISH WOMEN."

Translated From English

into Kurdish

By :

AZIZ GARDI

Baghdad. 1983

# پێشــەکی

ئەم نامیلکەیە لە ئینگلیزی‌یەکـەدا سەربەخۆ نی‌یە ، بەڵکو چوار بەشە لە کتێبێکی گەورە کە دەربارەی ئافرەتی تورکیاو فۆلکلۆریانە .. کتێبەکە ،خاتوو گارنێت نووسیویەو یەکەم جار ساڵی **١٨٩١** بڵاوبۆتەوە. ئەم کتێبە دوو بەرگە : بەرگی یەکەم **(٣٨٢)** لاپەڕەیەو چوار بەشـەو باسی ئافرەتی ڤلاشی‌و گریکی‌و ئەرمەنی‌و بولگاری‌و فرانکی دەکات . بەرگی دوەمیش **(٥٤٦)** لاپەڕەیەو دوو بـەشی سـەرەکی‌یە – بـەشی یەکـەم باسی ئافرەتی جوو دەکات‌و بـەشی دوەم بۆ ئافرەتی موسلمان تەرخان کراوە . ئـەم بەشـەیان **٢٤** بـەشی بچووکـەو باسی ئافرەتی کوردو چەرکەس‌و یوروك‌و ئەلبان‌و تەتەرو قەرەج‌و عوسمانلی دەکات. لـەم بیســت‌و چوار بەشـە بچووکەدا ، چـوار بەشەکـەی بەرایـی **(١،٢،٣،٤ ل ١١٣–١٨٩)** باسی ئافرەتـی کوردەو ئەوەیـە کـە لێرەدا کردوومانەتە کوردی .

سەرتاپای کتێبەکە زانیاری باش‌و بەکەلکی تێدایەو گـەلێ باس‌و بەسەرهات‌و چیرۆك‌و بیروباوەڕی جوراو جۆری باس کردوەو ئـەوە دەهێنێ کە هەمووی بکرێتـە کوردی ؛ بـەڵام لەبـەر ئـەوەی هـەم وەرگێڕانەکەی وەختێکی زۆری دەوێ‌و هـەم بڵاوکردنەوەکەی گران دەوەستێ وام بە چاك زانی تەنیا ئەم چوار بەشە بکەمە کوردی کـە پەیوەندی بە ئافرەتی خۆمانەوە هەیە .

حەز دەکەم کە خوێنەری خۆشەویست پێش خوێندنەوەی کتێبەکە ئەم سەرنجانەی لەبەر چاو بێ :

● کتێبەکە یەکەم جار ساڵی ١٨٩١ بڵاوبۆتەوە ، واتە پێش شەڕی یەکەمی جیهانی‌و ئەوساکە باری کوردستان لەگەڵ ئێستادا زۆر جودا بوو ، چ لەبارەی دابەشبوونەوە بێ‌و چ لە بارەی ژیانی کۆمەڵایەتی‌یەوە. ووشەی تورکیای ئەوسا ئەو هەموو ناوچانەی دەگرتەوە کە لە ژێر نیری ئیمپراتۆریەتی عوسمانلی‌دا بوون • هەر بۆیەشە دەبینن کە نووسەر لە زۆر جێگادا باسی وانو بایەزیدو سەعرەت‌و سلێمانی دەکات • بە کورتی نەخشەی ئێستای تورکیا لەگەڵ نەخشەی ئەوسا جودایە •

● نووسەر هەندێ شتی گوتوە کە لەوانەیە بەلامانەوە سەیر بێ‌و ئەقڵمان نەیگرێ ، ئەمە وایە ، بەڵام بۆیە وایە چونکە نووسینەکە تایبەتی نی‌یە بە ناوچەیەکەوە ، سەراپای ئەو بەشە فراوانەی کوردستان دەگرێتەوە کە هەینێ لەژێر نیری عوسمانلی‌دا بوو ، جگە لەوەی کە باسەکە نزیکەی نەوەد ، سەد ، ساڵ پێش ئێستا نووسراوەو هەڵبەت لەم ماوەیەدا باری ژیانی کوردو ڕەوشت‌و ڕەفتاری ڕۆژانەیان هەندێ گۆڕانی بەسەردا هاتوە •

● نووسەر لە هەندێ جێ‌دا کە ناوی کوردی هێناوە ، بە جەردەو ڕێگرو کێوی‌و وا باسی کردوە ، هەڵبەت منیش دەستم لێ نەداوەو وەکو خۆیم هێشتۆتەوە چونکە دەستپاکی لە وەرگێڕان‌دا ڕێی نەداوم ئەم جۆرە ووشانە بسڕمەوەو لایان ببەم • ڕاستە کورد ئەوسا زیاتر بە کۆچەری‌و گەڕیدەیی ژیاوەو جەردەو ڕێگری هەبوە بەڵام نووسەر دەبوایە مەوزوعیانە بدوێ‌و هەر هیچ نەبێ سەراپای نەتەوەکەمان بە جەردەو ڕێگرو شتی وا دانەنێ ، خۆ ئەوەندەش هەیە کە ئەو نووسەرە ئەوروپیانەی باسی کوردیان کردوە (زۆریان) لە کاتی نووسین‌دا کەوتوونەتە بەر کاریگەری بیروباوەڕی دوژمنانی کوردو نەیانتوانیوە بە تەواوی خۆیان لەم تەوژمە ڕاپسکێنن •

● نووسەر ، لە هەندێ جێگادا ، قسەی وای کردوەو ڕای وای دەربڕیوە کە زیاتر لە ئەفسانەوە نزیکن تا لە ڕاستی • بۆ نموونـە ، دەڵێ هەندێ کورد لـەو باوەڕە دان خوێنی ئینگلیزییان لـە دەماردا دەگەڕێ ، ئەمەش یان بۆ نـەوەکانی کـەیغانی ژنی فەقێ ئەحمـەدی داریشمانـە دەباتەوە ، یان بۆ تاقمێ خاچپـەرستی سەردەمی شـەڕی خاچپەرستان کە ڕێگایان بزر کردوەو لە کوردستاندا گیرساونەتەوە ؟ لە هەردوو باردا قسەکە خەیاڵێکی خۆشـە بۆ مرۆی ئەوڕووپیو لـە ڕاستییەوە دوورە •

● هەروەکو لە ناوی کتێبەکەشەوە دیارە ، نووسـەر بایـەخی زیاتر بە باری فۆلکلۆری کوردی داوە بە تایبـەتی چیرۆکو ئەفسانە ، هەندێ لەو چیرۆکانە هەر زۆر زۆر باون وەکو چیرۆکەکانی خۆجـە نەسرەدین ـ مەلای مەزبوورە •••

پێش ئەوەی کۆتایی بەم پێشەکییە بێنم حەز دەکەم بڵێم خاتوو گارنێت هـەندێ ووشەی کوردی یـان عارەبـی یان تورکـی بـەکار هێنـاوە ، منیش ووشـەکانم نـەگۆڕیوە ، چۆن ئاوا نووسیومنەتەوەو خستوومنەتە نێو دوو کەوانەوە « ••• » •

دوا جار ، هیوادارم کە خوێنەری ئازیز تام لە خوێندنەوەی ئەم نامیلکەیە وەربگرێ کـە من لام وایە بریتییە لـە هەندێ سەرنجی خێراو گشتی دەرباری ژیانی کوردو ئافرەتی کورد بە گشتیو هەندێ چیرۆکو بەسەرهاتی ئەفسانەیی بە تایبەتی •

ئیتر ئێوەو زەوقو ڕای خۆتان دەربارەی کتێبەکە ؟•

**عەزیز گەردی**
**بەحرکـە**
**١٩٨٣/٢/٥**

# بەشی یەکـەم

## ئافرەتی کورد : باری ژیانو پیشەیان

کورد لە چیاکانی ڕۆژهەڵاتی ئاسیای بچووك بـە پـەرتو بڵاوی هەن هەر لـە توورووسەوە تا قەوقاس ، لـە کوردستانیشدا لەگـەڵ هەندێ نەتەوەیتردا تێکەڵن . کورد دوو توخمن کە ئەدگارو ڕەوشتی ژیانیان تەواو پێچەوانەیـە : یـەکێکیان کۆچەری چوسـتو چـالاكو سەرخوایەو ئەوەی تریان تەپو سستەو خـەریکی کشتوکاڵـەو هێندە زیرەك نییە[1] . ئەدگاری جوتیارەکان لـە هی خێڵەکییەکان نەرمو ڕێکترە . خێڵـەکییـەکان لووتدرێژو قـەڵانگێ ، نێوچـەوان فیت ، چاو قووڵو تیژو بـە زۆری ڕەش ، لێو ڕەش یان شینو بچووك ، چەنەگە تیژن . کـە دەڕۆن هـەنگاویان توندو پۆڵـەو ڕۆیشتنیان بـە شانازیو دەبدەبەیـە ، کـە چـاوت پێدەکـەون وا دەزانـی ئاغـاو سەرداری وولاتن .

بە گشتی وەریبگری ، کورد گەلێکی بەهێزو لەشساغن . هەر چەندە ئاوهـەوای وولاتەکەیان لە گۆڕان دایـە بـەڵام باش دەکەونە ناو سالانو تەمەنێکی زۆر دەژین . منداڵیان پێستە ناسـكو ڕوومـەت گوڵن ، بنیـادەمی بچکۆلانـەی چـالاكو چـەتوونو قشتن . ئافرەتی جحێڵیش ، بـە تایبەتی لـە توورووس ، نموونـەی ئـەندام جوانـیو ڕێكوپێکین .

مستەر میلینگن ئەو ماوەی لـەناو ئەم جەردە چیاییانەدا ژیاوە

---

(١) پەندێکی تورکی هەیە دەڵێ : «گەوجە ، دەڵێی کوردە» ئەم پەندە تەنیا جوتیارەکانی کورد دەگرێتەوە .

زۆر کچی قۆزی دیوه ، بەم جۆره وەسفی نایابی کچێکیان دەکات :

« ئەدگاری کچەکە وێنەی خونچە سێوی قەدەغەی بەهەشتی سەر زەمینی بێبەخشیم • چاوه کاڵەکانی وەك تیشك لەناو ڕیزی موژه درێژو ئەستوورەکانیدا دەبریسکانەوه ، دەمو لووتیی ناسكو بێعەیب بوون • هەر چەندە بەرگی بەری هێندە پۆشتەو پەرداخ نەبوو بەڵام شێوەی نازداری لە تۆی ئەو بەرگەدا خۆی دەنواند • ئەوەی لە هەموو شتێ زیاتر سیحری جوانی پێدابوو سیمای سادەو هێمنو منداڵانەی بوو کە لە ڕوخسارو لەسەراپای ڕەفتاریدا دیار بوو »(٢) •

هەندێ کوردی بۆکتانو هەکاری دەڵێن گوایە نەوەی خەلیفە ئەمەوییەکانن • هەندێ گەڕیدەش لەو بڕوایەدان کە خێڵی (ڕۆوادی) ـ کە سەلاحەدین لەوان بوو ـ دەشێ هەمان خێڵی (ڕەڤەندی) یان (ڕەوەندی)ی هاوچەرخ بێ • سەرۆکەکانی خێڵی(بەبە) بە سووری بوونو متمانەوه دەڵێن گوایە خوێنی ئینگلیزییان لە دەماردا دەگەڕێو لە کەیغانی داپیره گەورەیان کەوتوونەتەوه ـ لە بەشێکی ئایندەدا ئەفسانەی ئەم کەیغانە دەگێڕمەوه(٣) ـ بەڵام چیرۆکێکیتر هەیە هێندە ئەفسانەیی نییە دەڵێ تاقمێکی سەر بە هەڵمەتی دوەمی خاچپەرستان(١١٤٧ـ١١٤٩)؟ لە سوریاوه بەرەو باکووری ڕۆژهەڵات چوونو لە گەڕانەوەدا ڕێیان بزر کردو وێڵ بوونو لە کوردستاندا گیرسانەوه(٤) •

ئەم دوو توخمەی باسمان کردن ، لە ناوەخۆیشیان جودانو بە

---

(2) Wild life among the Kurds.

(٣) بڕوانە بەشی چوارەم (کچێکی پاڵەوان) •

(4) Binder, Au Kurdistan, en Mésopotamic, &c, P. 110.

زاراوەی دەوارنشین یان (کۆچەر)و (جوتیار) یان « رەعایا Rayah" ناو دەبرێن •

دەڵێن جوتیارە کوردەکان چوار پێنج هێندەی جەنگاوەرەکان دەبن • جەنگاوەرەکان بە تەخمین (١٣) هەزار خێزانن و لەمانە (١٠) هەزاریان کۆچەرن و ئەوەی‌تریش لە شارو گوندەکان دەژین • ئەم هەموو جەنگاوەرە کوردانە سەر بە خێڵەکانن ، خێڵیش سێ جۆری هەیە : «عاشیرەت – ashirè خێڵی گەورە ، «قەبیلە – Quablilè خێڵی ناوەنجی ، «تایەفە – Taifé – خێڵی بچووك • ئەم خێڵانە بە ڕەشماڵ یان بە ماڵ حسێب دەکرێن و هەر ماڵێك یان ڕەشماڵێك ٥ – ٢٠ کەسی تێدایە • عاشیرەتی گەورە دەبێتە چەند قەبیلەو تایەفەیەك ، یان دەبێتە چەند تایەفەك • ووشەی تایەفە وا دەبێ بۆ عاشیرەت بەکار بێ ، جا چ گەورە بێ و چ بچووك • ئەو خێڵە بچووکانەی سەر بە هیچ عاشیرەتێك نین پێیان دەگوترێ تایەفەی لاتەریك •

عاشیرەت یان خێڵ ، لە خێزانی سەرۆك و هەندێ خێزانی‌دی پێك دێ کە کەم تا زۆر خزمایەتی‌یان هەیە • لە ناو هۆبەدا ، ڕەشماڵی سەرۆك لە هەموو ڕەشماڵەکانی‌دی گەورەترەو لەناو هەموویاندا دیارە؛ چونکە شوێنی پرس و ڕاوێژکاری و دادگا بەستن و کۆبوونەوەی گشتی پیرەکانی عاشیرەت و جێی میوانداری گشتی‌یە • هەستی عەشایەری و دڵسۆزی بۆ سەرۆك نیشانەیەکی سەرەکی ئەم گەلە سەرسەختەیە • لەگەڵ ئەوەش‌دا سەرۆك عاشیرەت حاکمێکی تاکڕەو نی‌یە • دەنگی پیرەکان سەنگێکی زۆری هەیەو وەك لەمەو دوا باس دەکەم ژنیش بەشداری سیاسەتی عاشیرەت دەکەن •

هەرچەندە ، ئەو ناوچانـەی ئێستا پێیان دەگوترێ کوردستان ، سێ هەزار ساڵە ، کەم و زۆر ، لەلایـەن زۆر کەسـەوە داگیرکراوە بـەڵام کورد هـەرگیز مۆرکی نـەتەوایـەتی خۆیـان نـەدۆڕاندوە • لـە سەرەتای داگیرکردنی عوسمانلی‌یـەوە تا ئێستا ئـەم کوردانـە ، بەردەوام ، لە نێوان دوو هێزی ئیسلامی ناحەز بەیەك دەهەژێنەوە کە سونەو شیعەن‌و لە تورك‌و فارس‌دا خۆیان دەنوێنن‌و کورد بە گوێرەی ڕۆژگار هەر ماوەی لەگەڵ یەکێکیان‌دا بوون •

هەر چەندە کە جەنگاوەرە کوردەکان زۆریان ئازار لـەو شەڕە بەدفەڕانە چەشتوە کە تورك‌و فارس پێیان‌فرۆشتن‌و هـەر چەندە کـە ئـەم دوو نـەتەوەیـە بـەدەوام دەرەبـەگی ناوەخۆیان وروژاندوە بۆ بێهێزکردنی جەنگاوەرە کوردەکان بەڵام ئـەم جەنگاوەرە کوردانە ، ئەگـەرچی سـولالـەو دەستووری سیاسی‌و ئایینـی دێرین‌و پاشـخانی مێژوویی‌و ئـەدەبی‌یان نەبوە بـە یەکـەوە بیانبەستێتەوە ، هێشتا هـەر توانیویانە بە نیمچە سەربەخۆیی بژین‌و وەك جاری جاران نەتەوەکەیان بە مۆرك‌و نیشانەو خـەسیەتەوە بپارێزن کە لـە نەتـەوە جیارەکانیان دادەبڕێنێ •

لەم سەدەی دوایی‌دا ، هیوای نەتـەوایەتی ، سێ جار ، دنـەی داون بۆ ئەوەی نیری تورکی فڕێ بدەن بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو ناوچە شاخاوی‌یانەی لێی دەژین ناوچـەیەکی پان‌و بەرینـە ، سەرکەوتنیان کـەم بوە ، یان هـەر نـەبوە • هیچ نەتەوەیەکی‌دی نەیتوانیوە وەکو ئەم نەتەوەیە ، کە وێ دەچێ جێگری کلدانیەکان بن ، لـە هـەڵو مەرجی وا سەخت‌و نالەباردا ، مۆرکی نەتەوایەتی خۆی بپارێزێ •

خانووی دەشتی کوردان بـە زۆری وەکو خانووی ئەرمـەنی‌یە

دراوسێکانیان ـ کە باسمان کردن* ـ بن عەردە ، کە گەوڕی لە (سەلاملغ ـ selamlik )یان ژووری گشتی دەکاتەوە • ئاگردانی چێشت لێنان بریتی‌یە لە تەندوورێکی زلی قوڕ ، ناوەڕاستەکەی بەرینەو لە سەرەوەو بنەوە تەسك بۆتەوە • لە ناوەندی ژووری سەرەکی ماڵەوە لە عەرد دەگیرێ • «تەزەك ـ tazak »**ی تێدەکەن کە سووتەمەنی‌یەکی خۆماڵی‌یەو بریتی‌یە لە قەسەرو شیاکەی ووشك کراوە • شیشەیەك دەخەنە سەر زارکی‌و کتلی‌یەکی بە زنجیرێك پێوە هەڵدەواسن • ئافرەت لە سەر ئەم ئاگردانە دادەنیشن‌و هیچ گوێ بە دووکەڵو کڵپەی ئاگر نادەن کە وەکو لە زارکی بورکانەوە دەربچێ ئاوا لە زەوی دەردەچێ‌و دووکەڵەکەش بە کونێکی بچووکدا دەچێتە دەرەوە کە لە بڵندی ، لە دیوار کراوەتەوەو نەختێ ڕوناکیشی پێدا دێتە ژوورەوە کە دانیشتوانی ماڵ قنیاتی پێ‌دەکەن •

کەلەوپەلی ناوماڵیان زۆر سادەیە • تەنیا هەندێ بەڕەو لێفە ، برێ حەسیرو کەمێ هەمبانە بۆ هەڵگرتنی ئەو جلوبەرگ‌و کەرەستانەی زۆر پێویستیان پێ‌نابێ • ماڵ بریتی‌یە لە ژوورێك کە نانخواردن‌و ژووری دانیشتن‌و ژووری نووستنەو سێ چوار نەوە دەگرێتە خۆی • لەو ژوورەوە دەچێتە ژووری ئازووقە کە کۆڵێکی چیمەنتۆی وەکو تابووتی کۆن‌و هەندێ جەڕەی جۆراوجۆری تێدایە ، ئەوەی هەرە گەورەیان چوار پێ بڵندەو وەکو « ئەمفۆرا ـ amphora »ی گریکی وایە • جۆرە بیرەیەك کە پێی‌دەگوترێ « بۆزا ـ Boza »و جۆرە شەرابێك کە پێی دەگوترێ « ناردەنك

---

* نووسەر لە بەرگی یەکەم ـ بەشی ٦ ، ٧ ، ٨ ، ٩ ی کتێبەکەی‌دا، باسی ئەرمەنی‌یان دەکات • (وەرگێڕ) •

** تەزەك : تەپاڵە (وەرگێڕ) •

nardenk »و له ئاوی هەنار دەردەهێنرێ ، لەم کۆڵەدا دروست دەکرێن • بێجگە لەمانە ژوورەکە هەندێ ئازووقەی تریشی تێدایە کە لەناو گۆزەی گەورە(٥) کراوەو بۆ خواردنی ماڵەوە دادەکرێ •

لە سلێمانی کە پێتەختی کوردانە باشترین جۆرە خانوو چوارگۆشەیەو یەك نهۆمە • بناغەی سێ پێ دەبێ‌و لە خشت دروست دەکرێ‌و بە قوڕی بە کا هەڵدەسوورێ‌و لای ناوەوەی ژوورە سەرەکی‌یەکان بە گەچ هەڵدەسوورێ‌و ئاغەبانیش کاریتەیەو قامیشی دەهاویشترێتێ‌و قوڕەپەست دەکرێ • دەوراندەوری خانوەکە حەوشێکی بە شوورەیەو لە ناوەڕاستەوە بە دیوارێك کراوەتە دوو بەش کە نە هەردوو سەرەوە لە ناوەڕاستەوە دەگاتە خانوەکە • لای پێشەوە کە سەلاملغە دەکەوێتە حەوشەیەکو لای پشتەوە کە حەرەملغە دەکەوێتە حەوشەکەی دی • باخچەیان بریتی‌یە لە پارچە فریزێکی سەوزو سێبەری دارچنارو تووی هاتۆتەوە سەرو بە بنەگوڵ دابەش کراوەو ئاوی چیای لە جۆگایەکەوە بۆ دێ • بەشی سەرەکی خانوو « تالار ـ Talar »، کە وەکو ژوورێك وایەو لای پێشەوەی تەواو والایە • لە وەرزی گەرمادا لەو تالارە دادەنیشن‌و هەر لەوێش دەخەون • تەنیا خەڵکە هەژارەکە لەسەر بان دەخەون • هەندێکیان لە فرچەی گەرمادا ، کە مانگێك درێژە دەکێشێ ، لە ترسی کێچ لەناو «چارداخ ـ tchardah » یان کەپر ، لە حەوشە لەسەر سەکۆ ، یان لەناو

---

(5) Xenophon in his "Avábádls," or retreat of the ten thousand:

دەڵێ : کاردوخی (Carduci) شەرابیان لە حەوزی چیمەنتۆ هەڵدەگرت : bk. 1v. chap. II.

خێوەت ، دەنوون ـ دەڵێن کێچ لەم ناوچەیە لە هەموو ناوچەکانیتری تورکیا پیسترو ترسناکترە •

سەلاملغ ژوورێکی گەورەو بەرفراوانی تێدایە ، ڕوناکییەکەی کزەو هاوینەکـەی فێنکـە • ژوورەکانی زستانی بـە دالآنێکی تاریكو درێژ دەگەنەوە یەك •

خانووی ئاسایی بریتین لە کوخی قوڕ کە وەکو گوندی عارەبی خۆیان دەنوێنن • هـەموو ئیشو کاری ماڵـەوە لـە دەرەوە دەکرێو سەراپای خێزانیش ، لـە بەرچاوی دراوسێو ڕێبواران ، لەسـەر بانی نزم دەخەون •

کوردستان بە زۆری بوورو بەیارەو باخچەو شینایی تەنیا لە نزیك شارو گوندە گەورەکان هەن • پاوان تاکە سەرچاوەی ژیانی خێڵەکانە• ئەم خێڵانە هاوینان ئەم چیاو ئـەو چیا دەسوورێنەوە بـە دوای پاوانو ئاودا بۆ مێگەڵە گەورەکانیان • خێڵ لـە مانگی ئاداردا دیمـەنێکی زۆر دلفرێنی هەیە • گا بار دەکەنو هەندێ جاریش وەك سەربار دوو سێ منداڵو لانکێکی لێدەنێن ، جـاری وایش هەیـە دایك لانك ، بـەو هەموو شتەی تێیدایە ، لە پشتی خۆی شەتەك دەدا •

هەندێ ژنو پیاو بە پێیان دەڕۆنو سەرپەرشتی کۆچو ڕەوەکە دەکەن • هەندێ زەلامی چەکداریش بـە شێنەیی دەڕۆنو پاسـەوانی کۆچەکە دەکەن • ئەمانە گۆچانیان لەبـەر کەمەردایەو شیرو قەلغانیان لە پشتە • لە کاروباری مەڕداریو مێگەل بەخێوکردندا ، پیاو بێچکە لـە چوونـە بەر مـەڕ هیچ ئیشی دی ناکەن • ئیشـەکانیتر هـەموو دەکەونە ئەستۆی ئافرەتان •

کورد بـە دەگمـەن گۆشتی مـەڕی خـۆیان دەخۆن • دەڵێن

گۆشتەکە لەوە گرانترە کــە بەوان بخورێ ، ئیدی بە زۆری قنیات بە بەرو بومی ڕێچال دەکــەن وەك : شیرو پەنیرو کــەرەو ماستو دۆ yoaurt ، لەگەڵ نانی تەنکی «تەندوور – tandour »و لــەباتــی پلاو برنج پلاو ساوار لێدەنێن • بە ڕێگایەکی زۆر سەرەتایی نقیشك دەگرن • مەشکەیەکی گەورە پڕ ماست دەکەنو بە دوو پەت ، بــە شێوەیەکی ئاسۆیی ، هــەڵیدەواسنو کچــە کوردێ دەیژەنێو پــاش ماوەیــەك ماستەکــە دەبێتــە نقیشــك • پــەنیریان کــە پێی دەگوترێ « ژاژك – djadjk »* و شتێکی زۆر بەتامە ، هەندێ گیای تیژی تێدەکەن کە نوکهەیەکی وەك هی پیازی پێدەدا •

بەرگی ئافرەتی چینی بەرزی کورد بریتی‌یە لــە ژێرکراسێکی فشی بە قۆڵو دەرپێیەکی بەرینی تورکی کــە بــە کەمەرێکی ئاوزێنە زێڕ یان زیو لە ناو قەدەوە قایم دەکرێ • کراسێکی لەســەر لەبــەر دەکەن وەکو کورتەکی زەلامان وایە ، ئەوەندە هــەیە شۆڕەو لــەبن گەردنەوە توند دەکرێو ژێر کراسو دەرپێی لێوە دیارە • کراس ، بە پێی وەرزو پایەی کۆمەلایەتی ئافرەتەکە ، لە ئارمووشی خەتخەت یان ڕەنگاوڕەنگ ، یــان لــە قومــاشی جورجێت یان قوستەنتینیە یــان قومــاشی گرانبــەهای ڕۆژەلاتــی دروســت دەکرێ • ئینجا « بیش – pish » کە بە زۆری لە قوماشی ئەتلەسەو وەکو کراس هــەڵدەبڕێ بەلام قۆڵەکانی کورتو تەسکەو ناگاتە سەر ئانیشك • زستانان ، لە باتی ئــەم بیشــە « لباردێ – Libardé » یان کورتەکی درێژی بــە لۆکە لەبەر دەکەن • ئافرەتی کورد هەندێ جار زستانان ، «چارۆکە – tcharokia »ی میللی لەبەر دەکەن کە وەکو عەبا وایەو لە قوماشی

---

* هەڵبەت پەنیرو ژاژی جیان و یەك شت نین (وەرگێڕ) •

داشداشی زەرد یان‌سوور دروست دەکرێ ، لەسەر شانەوە قایم دەکرێ‌و تا خوار ئەژنۆ شۆڕ دەبێتەوە • سەرپۆشیان زۆر پارچەیە • چەند دەسرۆکێکی ئارمووش یان چەند کۆلوانەیەك ، کە هەموو ڕەنگەکانی پەلکە زێڕینەیان تێدایە ، بە دەرزی وەکو تاجێکی دوو پێ بڵند لێك توند دەکرێن‌و لچکە درێژەکانیان شۆڕ دەبێتەوەو دەگاتە پاشپانی • هەندێ لەم تاجانە بە ڕیزە قەیتانی زێڕ دەڕازێنرێنەوەو هەندێ خشڵی زێڕی وەك گەلای بچووکیان پێوە شۆڕ دەکەنەوە کە لەگەڵ ملوانکەی دراوو مووروو جێگەی خشڵی ئافرەتی کورد دەگرێتەوە • سەرباری نالەباریی ئەم جۆرە سەرپۆشەو ئەو سەر رووتی‌یەی لێ‌ی‌پەیدا دەبێ دەڵێن ئافرەت بە شەویش لە سەری دەنێن‌و بۆ ئەوەی تێك‌نەچێ سەرینی بچووکی بۆ دادەنێن •

بەرگی ئافرەتی جوتیاریش دەق وەکو ئەمە وایە بەڵام هەمیشە لە قوماشی شین دەکرێ • چارۆکەیان شینێکی تۆختەو لە دامێنی حوارەوەی داخی سپی تێدایەو لچکەکانی لەسەر سنگ یان شان گرێ دەدەن‌و تاسێك لەسەر دەنێن‌و پرچیان لەسەر روو گڵوازە دەخواتەوە •

هەر چەندە ئافرەتی کورد بەناو موسلمانن بەڵام کە دەچنە دەرەوە زۆر بە توندی خۆیان داناپۆشن • لە شارێکی گەورەی وەك سلێمانی کچ قوماشی شینی داشداش‌و پۆشی ڕەش لەبەر دەکەن کە ئافرەتی تورك لەناو ماڵەوە لەبەری دەکەن • تەنیا ئافرەتی چینە بەرزەکان کە حەز دەکەن بە دزیەوە بە شەقامەکان‌دا بسوورێنەوە ئەم پۆشی‌یە بەردەدەنەوە ، هەندێ ئافرەتی چینە نزمەکان بە زۆری بە رووی والاوە دەسوورێنەوە • ئافرەتی لادێ کە بچنە سەفەرو لە دێ دەربچن خۆیان دەپۆشن • کۆچەریش کە دەکەونە کۆچ‌و ڕەو نەختێ

ڕوویان بە دەسرۆکێك یان لەچەکێك دادەپۆشن • لێرەدا بە پێچەوانەی لای تورکەکان ، نۆکەری پیاو بە سەربەستی هاتو چۆی حەرەمسەرای ئافرەتان دەکاو سەراپای خێزانیش بە ڕووی میوانی پیاوەوە دەچنو بەخێری دێنن •

سەرباری ئەم سەربەرستی‌یە ڕوکارەی ئافرەتی کورد لە ڕفتارەوە هەیەتی ، تا ئەوپەڕی شەرەفو داوێن پاکی خۆیان دەپارێزن • کورد ، نە ترسی باوی ناو ئەرمەنی‌یانو نە زێدەڕۆیی ڕەوشتپارێزی عوسمانلی‌یان هەیە • ڕاستی ، لە چاو نەتەوەکانی‌تری وولات ڕەوشتیان بێ وێنە بەرزە • ئافرەتی بەمێرد هەر خیانەتو ڕوخانێکی لێ‌ڕووبدا ، خێرا مێردی برینداری سزای مەرگی دەداو ئەو پیاوەی ناپاکیشی لەگەڵ ژنەکە کردوە بە هەمان دەرد دەچێ • ئەو کەسەی بەم جۆرە سزای ژنەکەی‌و دۆستی ژنەکەی بدات هیچ لەکەی کۆمەڵایەتی نایەتە سەر • بە پێچەوانەوە ، زۆر بە ڕیزو شانازی‌یەوە سەیری ئەم کردەوەیەی دەکەن • زۆر چیرۆك لە ناو کوردان هەن باسی ئەم جۆرە سزاو تۆڵەیە دەکەن •

چیرۆکێك هەیە باسی ئەوە دەکا چۆن کابرایەك کە سەرۆکی لەشکرێکی نانیزامی بوو لە بەغدا ، بیستی ئەو ماوەی لە ماڵەوە دوور کەوتبووەوە ، ژنە کرمانجەکەی گومانی بێ‌ئەمەکی‌و داوێن‌پیسی لێ‌کراوە ، بە دزی گەڕایەوە شاری خۆیانو شەو خۆی گەیاندەوە ماڵێ‌و ژنەکەی‌و دۆستی ژنەکەی پێکەوە کوشت •

چیرۆکێکی‌تر هەیە باسی ئەوە دەکا چۆن کابرایەك ، ئاغا ناچاری کرد ماوەیەك دوور بکەوێتەوە ، کابرا کوڕێکی (١٥) ساڵی هەبوو • ئەم کوڕە لەگەڵ زڕدایکی لە ماڵەوە بوو ، وەختێك زانی زڕدایکی

دۆستی هەیە ، هەردووکی پێکەوە کوشتن •

لەم هەردوو نموونەیەدا ، کردەوەکە زۆر بــە ڕیزو شانازی‌یەوە وەرگیراوەو ئــەوەی کردوویە دۆستو دراوسێ ئــەو پــەڕی ڕیزیان لــێناوە • خزمــی تاوانبارەکــانیش هیچ شــکاتیان نــەکــردوە لای دەسەڵاتدارانو هیچ ناڕەزاییشیان پێشان نەداوە • بە پێچەوانەوە ، ئەو تاوانــەی دەبێتــە هۆی کوشتنەکە تاوانێکی هێندە گــەورەو زلــە لای کورد ، کەس سەرخۆشیش لە خاوخێزانی کوژراوەکە ناکات •

زۆر چیرۆکی باوی دی لە بارەی ئافرەتی بەمێردو بێ‌مێرد هەیە کە مەردانە بەرگری‌یان لە شەرەفی خۆیان کردوەو ئەوەی دەستی بۆ درێژ کردوون .کوشتوویانــە • یــەکێ لــەم چیرۆکانە کــە هەر زۆر کاریگەرە ، ئەمەیە کە بە کورتی بۆتان دەگێڕمەوە :

ئافرەتێکی کورد چوبوەوە ماڵە باوانی‌و بە تەنێ لەگەڵ نۆکەرێکی پیاو دەگەڕایەوە ماڵی مێردی کــە ڕۆژەڕێ‌یەکیان بــەین بوو • لــە ڕێگادا ، کابرا خۆی گنخاندو لــەباتی ئەوەی پێش ڕۆژاوا بگەنەجێ ، شەویان بەســەردا هاتو ناچار لایان‌دایە خانێکی تەنیاو لاپەڕ کــە بە جێگای دزو جــەردان ناوی ڕۆیشــت بوو • کابرا ئەسپەکانی داکردو سەرکەوت بۆ ئەو ژوورەی خانمی لێ‌بوو •

نیازی گڵاوو بەدنمەکی‌ی بزووتو ویستی دەستی بۆ بەرێ بەڵام ژنە پێشتر لە مەرامی گەیشتبوو چەقۆیەکی بچووکی حازر کرد بوو • هەر هێندە کابرا دەستی بۆ درێژ کرد ، ژنە چەقۆکەی لــە گــەروو ختم کردو ساردی کردەوە • ژنــە نەوێرا لەم شوێنە پڕ سامو ترسە چاو لێك بنێ ، ئیدی لە قوژبنێك‌دا هەڵترووشکا تا ڕۆژ دەبێتــەوە • نیوەشەو ، لە دەنگی سمی ئەسپێك ڕاچەنی کە هاتو لە خانەکە نزیك

بووەوە چونکە بێجگە لـە پیـاو خراپ کێ زات دەکا بـەم شەوە ئەنگوستەچاوە بێتە ئەم خانە ترسناکە ؟ ژنە هەستی کرد کابرا دابەزیو دیاربوو لە تەویلە دەگەڕا ئەسپەکەی لێبەستێتەوە • کابرا لە خوارەوە جلەوی ئەسپەکەی بە دەستەوە بوو رایدەکێشا ، ژنە بیری کردەوە : «ئەگەر ئەم کابرایە ئەسپەکانمان ببینێ ، من تێچووم !» دەستی دایـە چەقۆکـەیو خێرا قۆڵێکی کابرای کوژراوی بڕیو لـە پەنجـەرەوە هاویشتی‌یە کابرای بیانی • کابرا ، سەنگرایەوە ، کشایەوە ویستی بۆ جـاری دوەم تێبـەڕێ ژنە قۆڵەکـەی‌تری کـابرای کوژراوی بڕیو ئەویشی تێگرت • کـابرا هـاواری کرد : « هۆ ، کابرا ، تۆ هـەر کەسێکی هەی ، بزانە من (دەرگۆ)ی (لیزان)[٦]م و لێت ناترسم ! »

ژنە لە خەنی خۆشی‌یان شاگەشکە بوو ، دەنگەکە دەنگی مێردی بوو • ئیـدی وەڵامـی دایـەوەو هـاواری کـرد : « کورە دەرگۆ ، ئـەوە مبنـم مـن ، (گوزێل)ی تۆم ، وەرە ڕزگـارم کـە ! » مێردی مەندەهۆشو ژنەکـەی پێك شادبوونو بـە دوو قۆڵی کەوتنـە قسـەو گێڕانـەوەی بەسـەرهاتی خۆیان : دەرگۆ نـەیزانی بوو ئـەو ڕۆژە ژنەکەی دەگەڕێتەوە ، وا نەبوو لەبـەر ئەوەش هاتبێ کـە دواکەوتنی ژنەکەی هەراسانی کرد بێ بەڵکو ئەو ئێوارەیە لەگەڵ تاقمە برادەرێك خەریکی بەزمو ڕەزمو ڕابواردن بوون ، قسە هاتە سەر باسی ئازایەتی دەرگۆ ، دەرگۆش بۆ ئـەوەی ئازایـەتی خۆی بسەلمێنێ گرەوی کرد کە نیوەشەو بە تاقی تەنێ بچێتـە باسخان و نیشانـەیەك لـەوێ بەجێ بێلێ • لە خانەکەدا خەریك بوو لە شوێنێك دەگەڕا نیشانەکەی لێدابنێ کە ژنەکەی قۆڵی بنیادەمی بۆ هاویشت • هـەر چەندە کە دەرگۆ وای

(٦) لیزان : شارێکە لە بەینی بتلیسو وان •

زانی ئەمە جەردەن لەوێ دالدەیان گرتوە بەڵام هیچ نەترساو ئەوە بوو.
نەبەردانە ژنەکەی دەنگ‌داو لێك ئاشکرا بوون .

مستەر ڕیچ ، کە بە کوردستاندا گەڕاوە ، تووشی کچێکی عاشیرەتی بلباس بوە کە تورکێك ویستبووی دەستی بۆ ببا ئەویش نەیکردبوە نامەردی ڕمێکی لێدابوو کوشتبووی . ئەم کچە شۆڕەسوارە چحێڵە بەرگی پیاوانی کردبوە بەرو لە خزمەتی فەیزوللا فەندی دا بوو ، هەمیشە گوێڕایەڵو دڵسۆزی بووو لە هیچ گەشتو گەڕانێك‌دا لێی‌دانەدەبڕا . ئافرەتی ئەم عاشیرەتە زۆر ئازاو بەجەرگن . جاری وا هەیە وەك جەردە ڕێگری دەکەن ، وای لەو بازرگانو ڕێبوارەی بکەوێتە بەر دەستیان ! هەر بەوەندە بەرۆکی بەر نادەن کە ڕووتی بکەن‌و چی پێیە لێی‌بسێنن بەڵکو دنەی دەدەن بۆ ئەوەی زەوقی هەڵبستێ ، ئینجا چۆنی بە خەیاڵی فراوینیان دابێ بەو جۆرە سزاو ئەشکەنجەی دەدەن ، وەکو ئەوەی کە دڕکی لە لەش ڕابکەن‌و بیڕووشێنن‌و چقلاژنی بکەن .

ژن‌و پیاو لەناو ماڵەوە بە یەك چاو ڕەفتاریان لەگەڵ دەکرێ . ژن لە هەڵس‌وکەوتنیاندا لەگەڵ دایك‌و باوك‌و خوشك‌و منداڵان زۆر لە پیاوان نەرمترن‌و بە شێوەیەکی گشتیش زۆر لە مێردیان نەرم‌و میهرەبانترو بێندرێژترن . بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم جۆرە ڕەفتارەو سەراپای ڕەوشتی کوردی ئاکنجی ، لەوە باشترم دەست ناکەوێ کە ئەم چیرۆکە سەرنجکێشەی خوارەوەتان بۆ بگێڕمەوە :

## ــ پاشا پەندێکی دایە ژنەکەی ــ(٧)

هەبوو نەبوو ، زۆر جاروا دەبوو ... با لە خوای گەورە

(7) Jaba, Recueil de Notices etRecits Kourdes, P.32,

بپاڕێینەوە ڕەحم بە دایكو باوكمان بكا كە ئێستا گوێیان لێمانە[٨] •

لە زەمانی پێشاندا ، پاشاكانی بایەزید هیچ ماڵو سامانیان نەبوو، تا بڵێی دەستكورت بوون • داهاتی دێكانو هەرچی بەروبووم هەبوو « عەیان – âyân »و « ئاغا – agha »كانی ناوچەكە دەیانبرد كە خاوەن موڵكی دەوڵەمەند بوونو زۆر نۆكەرو سەربازی ئازایان هەبوو، هەردەم ئامادەی شەڕو هێرش بوون • ئاغاكان بە نۆرە ئازوقەی ڕۆژانەیان بۆ ماڵی پاشا دەنارد • ژنی عەیانو ئاغاكان زۆر پۆشتەو پەرداخ بوونو شتی زۆر بە نرخو ناوازەیان هەبوو ، كەچی ژنی پاشاكان بەرگیان زۆر سادەو ساكارو ئاسایی بوو • ڕۆژێكی جەژن ، ژنی ئاغاو عەیانەكان چوونە جەژنانە و دەستماچ كردنی « خانم – hanum » • خانم كە سەیری جلو بەرگو خشڵی ئاغە ژنەكانو جلو بەرگی خۆی كرد ، لە خۆی تەریق بووەوەو زۆر پەستو شەرمەزار بوو •

ئێوارێ ، كە پاشا چووەوە حەرەملغ بینی خانم كزو عاجزە ، لێیپرسی : « ئەوە چ بوە ؟ بۆ وا عاجزی ؟ » ژنە وەڵامی دایەوە : « عاجزیو دڵبەغەمی بۆ من نەبێ بۆ كێ باشە ! ئەمڕۆ جەژن بوو ، ژنی ئاغاو عەیانان هاتبوونە جەژنانەم ، هەموو بەرگی نایابو بێوێنەیان لەبەر بوو ، سەراپای لەشیان خشڵو زێڕ بوو • بە بەرگی شاییو بەو هەموو خشڵەوە دەستیان ماچ كردم ، ئەدی شوورەیی نییە بۆ من كە خانمم بەو جلو بەرگە ساكارو خراپەوە بە دەمیانەوە بچم ؟ چ لەوە ناخۆشتر دەبێ ؟ »

پاشا وەڵامی دایەوە ، گوتی : « حورمێ ، شاژن ئەوەندەی بەسە

---

(٨) پێشەكی یەكی گشتییە بۆ هەقایەتی كوردی •

که پایەیەکی بەرزی هەبێ ، دەبێ بە پایەی خۆی ڕازی بێو بەرگی جوانو خۆڕازاندنەوە بۆ خەڵکی‌تر لێ‌بگەڕێ » • هەروەها گوتی : « ئەم هەموو ئاغەژنانە ، بە خۆو بە کرمانجەوە خزمەتکاری تۆن ، نرخی تۆ لەوەدایەو ئەوەندەت بەسە ! ئەم هەموو سوارانەش کە دەیانبینی هەموو فەرمانبەرداری منو بە هەموو دەمێ ئامادەن بەسەر دوژمن دا بدەن • گەورەیی لەوەدایە کرمانجت هەبێو سوار فەرمانبەردارت بن ، نەك جلی پۆشتەو خشڵی زێڕت هەبێ » •

بەڵام خانم گوێی نەدا قسەی پاشا داوای بەرگی جوانو زێڕو خشڵی ئەلماسی کرد • پاشا گوتی : « ئەم شتانە بە هەوەتە چنگ ناکەون ، بۆ ئەوەی ئەو شتانەت بێ دەبێ گوندت هەبێ ، جا ئێستا ناچارم دەست بە ڕووی هەندێ ئاغاوە بنێمو هەندێ کەس دەربکەم بۆ ئەوەی مووچەو بەراتەکەیان بۆ من بگەڕێتەوەو بۆ تۆ بە زێڕو بەرگی جوانی بدەم » •

چەند ڕۆژێکی پێ‌چوو ، پاشا بە دزی ئاغاو عەیانەکانی کۆکردەوەو بۆی باس کردن کە ژنەکەی داوای چی لێ‌کردوە • فەرمانی پێ‌دان نیوە شەو ، بە سواری بچنە دەرەوەو قۆڵ قۆڵ دەورەی شار بگرن • ئاغاو عەیانەکانیش بەش بە حاڵی خۆیان (٣٠٠٠) سواریان کۆکردەوەو شەش پەلیان پێك هێناو شاریان گەمارۆ داو چاوەڕێی فەرمانی شا بوون • بەیانی ، خانم لە پەنجەرەی خۆیەوە سەری هەڵکێشا دیتی لەشکر شاری ئابلووقە داوە ، خێرا پاشای واگا هێناو هاواری کرد : « هەستە ، ئێستا وەختی نووستن نی‌یە ، دوژمن تەلای ئابلووقە داوە ! » پاشا لەسەرەخۆ وەڵامی دایەوەو گوتی : « بڕۆ زێڕو بەرگە جوانەکانت بێنە بیاندە ئەو دوژمنانە بەڵکو وازمان

لێبێنن » • ژنە قیژاندی : « دەرکردنی دوژمن وا نابێ ، ئەگەر بە هەندێ پێك دێ ، من نە زێڕم گەرەکەو نە بەرگی جوان ، لە دەست دوژمن دەرباز بیم بەسمە » • پاشا پێی گوت : « مەترسە ، ئەوانەی ژنیان بە خشڵی زێڕو بە بەرگی پۆشتەوە هاتبوە جەژنانەی تۆ سوارو چەکداریان گەلێ زۆرە ، بەڵام ئەگەر حەز دەکەی هەموو یان دەردەکەم و مووچەکەیان بۆ تۆ بە زێڕو کوتاڵ دەدەم » • ژنە هاواری کرد : « خوا نەکا ، من شتی وام ناوێ ، ئامادەم بەرگی بەریشم بە گەلو سوپای دلێرمان ببەخشم • ئێستا پێ لێ دەنێم کە گەورەیی بە زۆریی سەربازو سوارە • زۆر بازرگانی دەولەمەند هەن ، بەڵام بازرگان چییان لە دەست دێ ؟ گەورەیی ڕاستەقینە بە دەولەمەندی نییە » •

پاشا چوە دەرەوەو فەرمانیدا سوارەکان پەرتەی لێ بکەن و بەرەو ماڵ بکشێنەوە ، بەڵام سوارەکان ڕازی نەبوون و گوتیان تا فیتە بەدەورێك نەکەین و هەندێ چەك و خشڵ بە تالانی بۆ خانم نەهێنین ناچینەوە • لێیاندا بەرەو قەرەداغ[٩] بۆی دەرچوون و بای سەد هەزار قرۆش تالانیان هێناو پێشکێشی خانمیان کرد ، بەڵام شاژن قبوولی نەکردو دایەوە سەربازەکان ، بۆی ڕون بوەوە کە بێ زێڕو جل و بەرگی جوان هەڵدەکات بەڵام بێ سەرباز دەسەڵاتی خۆی بێ ناپارێزرێ •

ئافرەتی کورد ، بە تایبەتی ئافرەتی خێڵە کۆچەرەکان دەورێکی چالاکیان لە کاروباری کۆمەڵایەتی و سیاسی خێڵدا هەیەو ئاگایان لە

---

(٩) قەرەداغ : چیای ڕەش : ناوی قەزایەکی ئێرانییە ، چل میل لە سنووری تورکیاوە دوورە •

هەر شتێکە کـە پەیوەندی بە خێڵەکـەیانەوە هەبێ ـ زەوی و زار ، ڕاوتەگیر ، فێڵو پیلان ، کە لەم هەموو کاروبارەدا تا بڵێی چوستو چاپووکن • ئافرەتیش هەروەکو پیاوەکانیان حەزیان لە بەزمو هەرایەو قەت شەکەت نابن بۆیە هەمیشە ووریان و بە هەموو دەمێ لەسەر پێن بۆ ئەوەی باز بدەنە سەر خانەی زین • هەر چەندە سواری کۆکیش نین بـەڵام لـە ناوەخۆیـاندا ، بۆ بـەزمو هـەرا ، شـان لـە شانی مێردیان دەدەن •

بەشداری‌کردنی ئافرەت لـە ژیانی سیاسی خێڵ ، تایبەتی‌یـەکی ژیانی کۆچـەری و دیاردەیەکی باری سـەرەتایی کۆمـەڵە • مستەر میلینگن دوو نموونە دێنێتەوە کە بە چاوی خۆی دیوینی لـە بەشداری کردنی ئافرەت لە کاروباری گشتی :

پاش قوونە شەڕێك لەگـەڵ خێڵی (شکیاخ) ، کوردەکان شکانو ٢٤ جـەنگاوەریان چووو گەڕانـەوە هۆبـەی خۆیان • وەفدێك بـە هەڵـەداوان چوە لای پاشای وان تکای لـێ‌کرد بێ بکەوێتـە بـەینیانو پێکیان بێنێتەوە • لێژنەیەك هاتو چـەند میلێك ما بوو بگەنە هۆبـەی خێڵی (شکیاخ) تووشی کۆمەڵە ئافرەتێك بوون ، پۆشی ڕەشیان بەستبوو تا هێزیان تێدا بوو دەیانشریقاندو هاواریان دەکرد • خـەمی گـرانی ئافرەتەکانو بەرتیلی (زاژك)(١٠)ی بە تامو بۆی کوردی مەسەلـەکەی چارەسەرکردو بـە هۆی ناوبژیکاری ئافرەتانەوە دەستیان لـە شـەڕو تۆڵە هەڵگرت •

کورد بە گشتی کاروباری پاکۆدانی حسێبیان لەگەڵ ئەو باجەستێنە

---

(١٠) زاژك : پەنیرێکە نوکهەی پیازی هەیە • پێشتر باسمان کرد • (زاژك و پەنیر جودان ـ وەرگێڕ) •

ڕەزاگرانانەی دەچنە ناویان ، بۆ ئافرەتان بەجێ دێلن •

جارێکیان باجەستێنێك چوە هەواری حەیدەرانلی‌یان کە خێڵێکی گەورەو دەوڵەمەندەو لە دەشتی باکووری ڕۆژاوای وان هەڵی‌داوە • بوو بە میوانی ڕەشماڵی عەلیاغای سەرۆك خێڵو بەخێرهاتنێکی گەرمیان کردو قاوەی خەستو جگەرەیان پێشکێش کرد ئینجا عەلیاغا بە هێمنی پێی گوت سەربەست‌بێو بچێ بە ناو ڕەشماڵەکاندا بگەڕێو مەڕانە ژنۆ بناتەوە • کابرا کە چوە ناو ڕەشماڵەکان دیتی کە دەیەوێ شتەکان حسێب بکا ئافرەت تا پێ‌یان بکرێ شتی لێ دەشارنەوە • بە لاملی لەگەڵ یەکتر دەجوولانەوە ، ئیدی زۆری نەبرد لێك‌گیربوونو بە دارو بەرد وەری گەڕانێو چی خراپەی‌یان‌کرد • کابرا بە پڕەپڕ هەڵاتو هەر چا بوو پیاوەکانی خێڵەکە هاتنو لە دەست ئەو ئافرەتە توندو تووڕانە دەریان هێناو بە ساغو سەلامەتی بردیانەوە ڕەشماڵی سەرۆك • عەلیاغا بە شێوەیەکی دۆستانە ئامۆژگاری کرد کە ئافرەت چی دەدەنێ بە زیاد بێ ، وەری بگرێو یەکسەر بگەڕێتەوە وانو سوپاسی خوا بکا کە خراپتری بەسەر نەهاتوە ، گوتی : « کوڕی باش ، چ دەکەی لەگەڵ ژنان ؟ چی‌یان بوێ وا دەکەن • جا پارەکەت وەربگرەو بڕۆ » •

ساڵی ١٨٥٤ سەلەفە سوارێکی کورد بە سەرۆکایەتی قەرە فاتمە خاتوون بە قوستەنتینیەدا تێپەڕینو بەرەو مەیدانی شەڕ داکشان • ئەم ئافرەتە ، ئافرەتێکی چورچو بوودەڵە بوو(١١) و بێجگە لە ئاگری نەبەردی کە لە چاوەکانی ئاورینگی دەدا هیچ نیشانەی سوارچاکی لە دیمەنو ئەدگاردا دیار نەبوو •

---

(11) Mordtmann, Die Amazoner, P. 132.

کوردی کۆچەرو جوتیار بایەخێکی زۆر کەم بە خوێندەواری دەدەن • کوردی ئاکنجیی سلێمانیو مەڵبەندەکانیتر وە نەبێ بە تەواوی نەخوێندەوار بن ، ئەوانیش مەلاو پزیشکی ڕووحییان هەیە لە خۆیان کە یاساو دەستووری ئیسلامەتی لە خەڵك دەگەیەنن‌و لە حوجرەکان دەرز دەڵێنەوە • کچو ژنی کوردە خوێندەوارەکان بە لایەنی کەمەوە فێری خوێندنەوەو نووسینی فارسی دەکرێن کە زمانی ئەدەبییە چونکە سەرباری ئەو هەوڵەی هەندێ مەلا ، لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا ، دایان بۆ ئەوەی بە زمانی کوردی بنووسن ، ئەدەبی کوردی هێشتا هەر بە نەبوو دادەندرێ • زمانی کوردی هیچ پەیوەندی بە زمانی فارسیو تورکییەوە نییە و چەندی خێڵ تێدایە ئەوەندە زاراوەی هەیە • وەك دیاردەیەکی سروشتی ، تێکەڵاو بوونی بەردەوام بۆتە هۆی ئەوە کە زۆر ووشەی تورکیو بە تایبەتیش ووشەی فارسی بکەوێتە ناو زمانەکەیانەوە • ژنە کورد بەهرەو سۆزی شیعر دانانیان زۆر بە هێزەو زۆر گۆرانی ناسكو کاریگەر لە بارەی ڕوداوی کۆمەڵایەتیو خێڵایەتی دادەنێن* •

دەڵێن یەزیدی کە یازدە خێڵی جوداو حەفت هەشت هەزار خێزان دەبن دوژمنی هەموو جۆرە خوێندەوارییەکن‌و نەخوێندەواری یەزیدییان بۆتە پەند لای گەلە دراوسێکانیان • چینی بەرزی پیرەکانی لێدەرچێ پیاویان بە گشتی نەخوێندەوارن ، هەڵبەت ئافرەتیشیان لە هەمان باری نەخوێندەواری دان •

---

* ئافرەتی کورد هەبوە لاوکبێژی هەلکەوتوو بوەو ، شەو تابەیانی بەرامبەر پیاوان دانیشتوەو لاوکی چریوە • بێجگە لەوەی کە لە بەستەو بالۆرەو هەموو جۆرەگۆرانییەکانی تریش دەستێکی باڵای هەبوە – وەرگێڕ – •

# بـەشی دووەم

## ئافرەتی کورد : داب‌و دەستووریماڵەوەیان

کچە کورد دەتوانن خۆیان مێرد بۆ خۆیان هەڵبژێرن‌و دڵداری کردن قەدەغەو سەیرو ناجۆر نی‌یە ، بەڵام دەبێ باوکی کچە ڕازی بێ . ئەوەیش هەیە ، هەندێ جار ، ئەگەر کچ‌و کوڕەکە سەبارەت بە ماڵ یان بە هەر شتێکی‌تر ، تەگەرەیان خرایە پێش ، بە دوو قۆڵی ڕادەکەن واتە کچە بە دوو کوڕەکە دەکەوێ . لە ناو خێزانی سەرۆك خێڵەکان « ژن هێنانی بۆ قازانج » باوەو بە زۆری کوڕو کچەکە لێك‌غەریب‌و نەناسن .

ڕەوشتی داخوازی وایە ؛ ماڵی کوڕە دەچنە ماڵی کچەو لەوێ بەخێرهاتنیان دەکرێ‌و شەربەت دەخورێتەوە . (شەربەت خواردنەوە)[1] بەلای کوردەوە نیشانەی داخوازی‌کردنە . ئامادەبوونی زاوا لەم داخوازی کردنە شتێکی پێویست‌و ناچاری نی‌یە ، بە زۆری وا دەبێ کە خزمێکی نزیکی ، ئەگەر برای هەبێ برای ، دەبێتە وەکیلی و چی دیاری‌یەك باوە لەگەڵ خۆی بۆ بووك‌و دایك‌و باوکی بووکی دەبا .

نیشانەی هەرە دیاری زەماوەندی کوردی « چۆپی - "tchopee" » گێڕانە کە شایی‌یەکی میللی‌یەو ئافرەت وەکو جوتیاری ماسیدۆنی‌و بولکاری زۆریان مەراقە . لە ئاهەنگ‌و زەماوەندی بووك

---

(١) شەربەتی ڕۆژهەڵات لە بەری میوە دەگیرێ‌و بۆ ساردکردن بەفر یان سەهۆڵی تێدەکرێ .

گواستنەوەدا ، زۆر کەس بێ ئـەوەی لێیان بگەڕێتـەوە دێن‌و دیاری بچووك بۆ بووك دێنن بۆ ئەوەی بەشداری چۆپی بکەن • ئەم شایی‌یە میللی‌یەی کوردان زۆر لـە « هۆرا – hora »ی گریکـی دەکا • شایی‌کەرەکان بە شێوەی نیو ئەڵقەیی دەستیان تێك‌دەگرن‌و بە نۆرە پێ‌یان دەجولێنن‌و لـەشیان بـە ڕێکی بۆ پێشەوەو پاشـەوە دەبزوێنن‌و لەگەڵ ئەم جولانەوەیەش‌دا هاوار دەکەن • ئەوەندەهەیە هەنگاویان لە هی هۆرا هێواشترەو جوداوازی‌یان هەیە کە بەم جۆرە باس کراوە : « هەموو بازنەکە بە نەرمی‌و شەپۆلاوی ، بـە ڕێك‌و ڕەوانی لەگـەڵ ئاوازەکەدا وەك کەروێشکەکردنی تەبارەی بـەر با دوجوولێتەوە » • لە کاتی شایی‌کردن‌دا ، جەنگاوەری کورد ئەو پەڕی هەست ناسکی‌و گفتار هێمنی‌و ڕەفتار شێنەیی پێشان دەدا بە تایبەتی کە لەگەڵ دەزگیرانی شایی بکات ، چونکە ئەگەر چ بێگانە لەوێ نەبێ ، ئەمەیان لە ئاهەنگی بچکۆلانەدا شتێکی زۆر ئاسایی‌یە ، لە بۆنەو مناسبەکانی‌دی‌دا ژن‌و پیاو بە جودا شایی دەکەن ، ئەو کاتەش شایی‌یەکە هەر چەندە قەوغە بێ‌و حەشامەتەکە هەر چەندە زۆر بێ ئافرەت سەریان داناپۆشن • شایی بە زۆری لەبەر ئاوازی «بلوان – bilwan »* دەگەڕێ کـە لـە قامیش دروست دەکرێ‌و هەندێ پیکی دەخرێتە سـەر • ئاوازەکـەی نـەرم‌و خۆشە • ئاوازی کوردی هەر چەندە لەسەر یەك بار دەڕوا بەڵام بـە شێوەیەکی گشتی ، بە پێچەوانەی ئاوازی تورکی‌و فارسی ، گۆڕانەکەی ڕێك‌و تەبایە • ئاوازەکەی بە زۆری نەرم‌و غەریب‌و غەمناکە ، هەست‌و سۆزێکی وای تێدایە پیاو لە خێڵەکی‌یەکان ڕانابینێ ئـەو ئاوازەیان لـە سنگ دابێ کـە لـەناو ئێمـەدا تەنیـا بە لامل‌و ڕەقـەکارو تالانکـەر ناسراون •

* بلوان نی‌یە بلوێرە (وەرگێڕ) •

له زه‌ماوه‌ندا ، چۆپی چه‌ند سه‌عاتێك ده‌خایه‌نێو شاییه‌که‌ره‌کان ده‌گۆڕێن • یه‌که‌م جار پیاو شایی ده‌که‌ن ، ئینجا ئافره‌ت • مسته‌ر ڕیچ به‌م شێوه کاریگه‌ره وه‌سفی ده‌وری دیاری کچان ده‌کا له‌م به‌زمه میللی‌یه‌دا :

« دیسان ئاوازی چۆپی لێ‌یداو ده‌وری (٣٠) کچ به ڕیزو ده‌ست له‌ناو ده‌ست ، به هه‌نگاوی ناسك‌و به شێنه‌یی چوونه پێش ، بێ هیچ پێچه‌و پۆشی‌یه‌ك ، له‌ناو به‌رگی ئارمووشی ڕه‌نگاوڕه‌نگ‌دا ده‌دره‌وشانه‌وه • به ڕاستی ، ئه‌مه دیمه‌نێکی جوان‌و دیارده‌یه‌کی نوێ بوو بۆ من که قه‌ت له ڕۆژهه‌ڵات ئافره‌تم نه‌دی بوو ، به تایبه‌تی کچ ، که وه‌کو ئه‌مانه هێنده به سه‌ربه‌ستی له‌گه‌ڵ پیاوان تێکه‌ڵ بن‌و خۆیان دانه‌پۆشن • له‌م ڕووه‌وه ژنه خێڵه‌کی عاره‌بیش پێیان ناگه‌ن » •

« ڕیزی کچه‌کان به هێواشی ، وه‌ك شه‌پۆل ، له ده‌وری ئه‌ڵقه‌یه‌ك ده‌سووڕایه‌وه • هه‌ندێ جار هه‌نگاوێك بۆ ناوه‌وه ده‌چوونه پێش‌و هه‌ندێ جار ده‌کشانه‌وه • زۆر به ڕێك‌و پێکی له‌نگه‌ری له‌ش‌و سه‌ریان ڕاده‌گرت • ئاوازه‌که هێمن‌و له‌سه‌ره‌خۆ بوو • جولانه‌وه‌یان زێده‌ڕه‌وی تێدا نه‌بوو • ئه‌م شایی‌یه نیو سه‌عاتێکی خایاند ، ئاوازه‌که بڕایه‌وه‌و کچه‌کان په‌رته‌یان کردو گه‌ڕانه‌وه ماڵی خۆیان به‌ڵام له پێش‌دا سه‌راپای خۆیان داپۆشی ، دیاره ئه‌مه‌ش شتێکی زیاده‌کی بوو ؛ چونکه ئه‌و حه‌شامه‌ته‌ی هاتبوونه دیار شایی‌یه‌که زۆر له‌وه‌ی زیاتر بوو که کانی وا له شه‌قامه‌کانی سلێمانی تووشیان ده‌بی » •

لای کورده به‌ناو موسلمانه‌کان ، ماره‌کردن به زارو له حزووری « ئیمام ـ Imam »یێك ده‌بێ • زاوا له‌گه‌ڵ چه‌ند خزم‌و براده‌رێکی ده‌چنه ماڵی باوکی بووك‌و پاش ته‌واو بوونی دابی ماره‌یی بووك سواری

ئەسپ دەکاتو دەیبا • هەر چەندە کە بووك بەو دیاری‌یانەی لە کاتی دەزگیرانەتی‌دا بۆی ڕەوان دەکرێ نرخی دەدرێ ، بـەڵام جاری وا هەیە زاوا هەڵی دەگرێ • کورد هەر چەندە کە موسلمانیشن ، بـە کردەوە پەیڕەوی ڕێبازی یەکژنی دەکەن و تەڵاقیش هەر چەندە ڕێی دراوە بەڵام زۆر دەگمەنە لەناو کوردان ، سوێندی ئاسایی‌یان ئەمەیە : «تەڵاقم بکەوی ئەگەر ئەمن •••» ئەمەش زۆر باش دەری دەخا کە کورد حـەز ناکـەن ژنیان تـەڵاق بدەن ؛ کەچی یـەزیدی پەیڕەوی دەستووری فرەژنی دەکەنو جاری وا هەیە وەك تورکەکان سێ ژنیان هەیە • ژن هێنان لە خزمی نزیكو خوشكو برای ژن لەناو یەزیدی‌یان باوەو وەکو هی کوردە موسلمانەکان نی‌یـە ، یەزیدی ڕێ لـە تەلاق ناگرن • داخوازی‌یان وایە کە برادەرەکانی بووكو زاوا ڕێگا خۆش دەکەنو شێخێکی ئایینی لێکیان مارە دەکا • دابەکە وایە کە بووك و زاوا دەچنە حزوور پیرو ئـەویش بەرەکـەت بەسـەر هـەردووکیان‌دا دەخوێنێو زاوا نانێك دەداتە شێخو نانێکی پیرۆزی لـە باتی لـە شێخ وەردەگرێو لەگەڵ بووك دەیکاتـە دوو کـەرت • دەڵێن کـە زاوا بەڵێنی ژنو مێردایەتی دەدا لەناو ئاوی ڕەوان دەوەستێ بـەو مانایەی کە بەم چەشنە ڕووی سەختی بەلێنەکـە دەشواتەوەو لـە پەیمانشکێنی تاوانی کـەمتر دەبێ • چینـە نزمـەکانی ئـەم تاقمـە ئایینی‌یـە کە « پیر ـ Pir »و « قەووال ـ Kawwal »ن ، ڕەمـەکی خـەڵك لێك مارە دەکەن ، بەڵام هەندێ جار ، پایە بەرزەکان بۆ مارەیی دەچنە لای شێخ (نەزەر) ، یان پیری گەورە •

جەنازەی کوردی ، کە پێچەوانەیەکی زەقی ئەو گرانی‌یە هێمنەیە کە موسلمان لە کاتی مردن‌دا پەیڕەوی دەکەن ، دیمەنێکی لە هەمووی کاریگەرتری هەیە • ئەگەر مردووەکە کابرایـەکی گرنگ بێ ، ئـە

کاتی ناشتنی جەنازەکەی‌دا ، دابی سەربازی بەجێ دێن‌و لــە هەندێ شوێن‌دا ، بۆ نموونە وەك کرمەنشاە ، بە ئاوازو گۆرانی‌یەوە جەنازەکە بۆ گۆڕستان بە ڕێ دەکەن • کە جەنازەکە لە ماڵەوە دەبەنە دەرێ ، ژن‌و پیاو شێتانە دەردەپەڕن‌و دەکەنە ڕۆڕۆو قەپ‌و قیڕو دادو فریاد • ئافرەت پرچیان دەڕننەوەو جل بەرگیان دادەدڕن ، هەندێکیان دەست بۆ ئاسمان بەرز دەکەنەوەو هەندێك دادێنەوە سەر عەردو قوڕ بەســەری خۆیان‌دا دەکەن • ئەم خەمە گرانە بە گفتارو ڕەفتار دەردەبڕن •

دابی جەنازەی یەزیدی‌یان شتێکی تایبەتی‌و خۆشە • کە یەکێکیان کەوتە بەر ئاوزنیگان بانگی قەووالێك دەکەن ، دێ هەندێ ئاوی دەکاتە دەم • ئەگەر قەووالی بەسەر نەگات‌و گیانی دەربچێ دابەکــە بو ئەو وەختە هەڵدەگرن کە جەنازەکە دەبەنە گۆڕستان • کە مەیتەکە نەناو گۆڕ درێژ دەکەن دەستەکانی لەسەر سنگی لێك تێ‌دەپەڕێنن ، وەکو هی موسلمانان لە تەنیشتی‌یەوە درێژی ناکەن • پارچە نانێك‌و هەندێ دراوو داردەستێك دەخەنە ناو کفنەکەی بۆ ئەوەی کە فریشتەی هاتە ســەرو پرسیاری لێ‌کرد ئەم شتانەی بــە کــەڵك بێ چونکــە یەزیدیش وەکو موسلمانان بڕوایان بە هەق‌و حسێبی دوای مردن هەیــە • « مونکر ـ Munkir » کە لەگــەڵ « نەکیر ـ nakir » هــات‌و پرسیاری لــە بارەی بڕواو چۆنیەتی ژیانی دونیاوە لێ‌کرد ، ئەگەر پێی ڕابگەیەنێ کە هەقی چوونە بە هەشتی نی‌یە ، مردوەکە هەوڵ دەدا بــە بەرتیل بڕیارەکەی پێ بگۆڕێ ، یەکەمجار بە نانەکە ئینجا بە دراوەکە ، خۆ ئەگەر بەرتیل دادی نەدا ئەوا بە زەبری داردەستەکەی ڕێگای بەهەشت بۆ خۆی دەکاتەوە •

تا مەیتەکە لە ماڵەوە بمێنێ قەووال لەسەری دەخوێنێ‌و لەگەڵینی

دەچێتە سەر گۆڕو بخووردانێك بە دەستەوە دەگرێ کە لەگەڵ ڕۆیشتنەکەدا دەسووڕێو بۆن بڵاو دەکاتەوە • تا ماوەی چەند ڕۆژێك ، خزمو دۆستی مردوەکە سەر لە ئارامگای دەدەن • ژنو پیاو بە جوداو بە کۆمەڵ ، هەموو سبەینەو ئێواران دەچن • ژنەکان دەگریێنو دەلاوێنەوەو پیاوەکان بە کپی دادەنیشنو بخوور دادەگیرسێنن[۲] •

لەبەر ئەوەی کە ئاو یەکێکە لە ڕەمزەکانی « یەزد ـ Yazd » و ژیانیش دەبەخشێ ، بۆی هەیە بۆیە لە کاتی ئاوزینگاندا ئاو لە دەمی مردوو بکەن تا پاش مردن ئاوەکە ژیانی پێبەخشێتەوە ، یان بکەوێتە شێوەیەکی ترەوە کە لەگەڵ بڕوای یەزیدییان بگونجێ •

ئافرەتی کورد ، بۆ ماتەم ، لەباتی ئەو بەرگەی لە دەرەوە لەبەری دەکەن ، جلی ڕەش دەپۆشن •

(2) Comp. Badger, The Nestorians, & C., P. 131.

# بـەشی سێیەم

## ئافرەتی کورد : بیروباوەڕیان

لەبەر ئـەوەی لـە باسی ئافرەتی عوسمانلیدا* بـە گشتی باسی بیروباوەڕی ئافرەتی موسلمان دەکەم ، لێرەدا باسی ناکەم ، هەر هێندە دەڵێم کە کورد بە پیرەوکەری بێباکو کەمتەرخەمی پێغەمبەر ناسراون • قسەیەکی باو هەیە دەڵێ : « پیر لە کوردستان پـەیدا نابێ » • کورد لە جێ بەجێ کردنی ئەرکی ئایینیدا زۆر خەمساردو بێباکن ، هەرگیز، وەکو عوسمانلییە دراوسێکانیان، بە گەرمی لا لە ڕۆژووی «ڕەمەزان ـ Ramazan » ناکەنەوە • بۆ نموونە لە ڕۆژهەڵاتەوە تا ڕۆژاوا فیتو هۆڕی جگەرەیانەو بە نوێژی نیوەڕۆ قوم لە «نەرگیلە ـ Narghilah دەدەن • پیلەکە لەسەر ئـەوە دەکـەن دەڵێن : « پێغەمبەر جگـەرەی قەدەغە نەکردوە • پێغەمبەر هەر ناوی جگەرەیشی نەبیستبوو ، جا یەکێ ناوی شتێکی نەبیستبێ چۆن قەدەغەی دەکا ؟ بێجگە لەمـەش دووکەڵ خۆی چییە ، دووکەڵ هیچ نییە ، یان وەکو هیچ نەبێ وایـە » • لـەولاوەش تورك قەت خـۆیان لـە کاروباری ئایینـی کوردانـەوە هەڵناقورتێنن • مزگـەوتی کوردان ئیمامەکـەی کوردەو لە خۆیانە ، مـەلای کورد دەستووری ئیسلامییان تێدەگەیـەنن‌و مامۆستای کورد

---

* لە بەرگی دوەمی کتێبەکەدا ، پاش هـەموو نەتـەوەکان باسـی ئافرەتی عوسمانلی کراوە ،کە بە شێوەیەکی گشتی ئەوانەیتریش دەگرێتەوە (وەرگێڕ) •

دەرز بە منداڵیان دەڵێن • سەرباری ئەم ڕاستی‌یانەش مەلاکان وەك چین‌و توێژێك ، لەبەر چڵێسی‌و چاوچنۆکی خۆیان تا بڵێی لەناو برا کوردەکانیان بێ‌حورمەتن • ڕاستی ، جێگای گاڵتەو تیزو قەشمەرین لای کوردەکان •

کەم‌و کورتی مەلاکان بۆتە کەرەستەی چیرۆکی بێ‌ژمارەی گاڵتەجاڕی • ئەمەش هەندێ نموونەی ئەم تەرحە چیرۆکانە :

## مەلای چڵێس(١)

جارێکیان ، مەلایەك‌و دوو کەسی نەخوێندەوار پێکەوە چوونە سەفەر • گەیشتنە ڕوبارێك ، هەموو خۆیان ڕووت کردەوەو بە مەلە ملیان بە ڕوبارەکەوە نا • مەلا پێش‌کەوت ، کە گەیشتنە ناوەندی ئاوەکە ، مەلا چوار گۆزەی پڕ کەرەی بینی لە تەنیشتی‌یەوە بە ڕوبارەکەدا دەهاتنە خوارێ • یەکەم گۆزەی گرتەوەو بە ددانی گرتی • دەستی ڕاستەی درێژ کردو گۆزەیەکی‌تری گرتەوە ، بە دەستی چەپەش گۆزەیەکی‌تری گرتەوە ، بەم جۆرە سێ گۆزەی بۆ خۆی گرتەوەو مایەوە یەك گۆزە بۆ هەر دوو هاوڕێکانی • مەلا بە سێ چواریەکی دەستکەوتەکەش دڵی دانەکەوت بانگی کردە هاوڕێکانی : « سوێندم بە خوا لەو گۆزەیەی لای ئێوەش بەشی خۆمم دەوێ »(٢) •

---

(1) Jaba, Recueil de Notices et Rècits kourdes, P. 18.

(٢) ئەم چیرۆکە پەندێکی کوردی لێ‌پەیدا بوە دەڵێ : « سێ گۆزەی بردوە چاوی تێر نەبوە ، داوای چوارەمیش دەکا » •

## مەلا بە قسەی خۆی تێدەکەوێ(٣)

دەڵێن مەلایەك لـە کوردستاندا هـەبوو ناوی بایـەزید بوو • هەموو جارێ پـەندو ئامۆژگاری کوردەکانی دەکردو ڕێی دینـی بۆ ڕون دەکردنەوە • ڕۆژێکیان لە مزگـەوت وەعزی دەدا ، دەیگوت : « ئەی گـەلی موسلمانینە ، هـەر کەسـە دوو کراسی هـەبێ پێویستە یەکێکی لە ڕێ خوا بداتە هەژاران ، هەر کەسێ دوو نانی هـەبێ ، ئەگەر موسلمانی ڕاست بێ ، دەبێ نانێکی بداتە برسیو کلۆڵان » •

بە ڕێکەوت ، لەو کاتەدا مەلاژن بەلای مزگەوتدا تێپەڕیو کە گوێی لەم قسەیەی مێردی بوو ، بایداوەوە چوەوە ماڵێ ، مەلا دوو کراسی هەبوو ، کراسێکی لە بەر بوو ، کراسێکی بۆ شووشتن فڕێدا بوو ، ژنە کراسەکەی ماڵەوەی هێناو بە هەژارێکی بـەخشی ، نیوەی نانو خواردنی ماڵەوەیشی بەسەر برسیاندا بەشیەوە • ئێوارێ مەلا هاتەوە بـە ژنەکـەی گوت : « حورمێ ، کراسەکـەم دزوون بوە ، کراسی ماڵەوەم بۆ بێنـە با ئەمـەیان دابنێم بۆم بشۆیت » • مـەلاژن وەڵامی دایەوە : « ئەمڕۆ کراسە زیادەکـەتم کردە خێرو نیوەی نانی ماڵەوەیشم بەسەر هەژاراندا بـەشیەوە » • مەلا تووڕە بوو ، بـە ژنەکەی گوت : « کچێ چۆن کراسو نانی ماڵەوەت بە فیڕۆ داوە ؟ » ژنە وەڵامی دایەوە : « بە فیڕۆدانی چی ؟ تۆ ئەمڕۆ خۆت لە مزگەوت وەعزت دەداو خەڵکت هاندەدا هەرچی کەلوپەلی زیادەیان هەیە لەگەڵ هـەژاراندا بـەشی بکـەن بۆ ئـەوەی خوا لێیان ڕازی بێ • منیش هەستام چی لە خۆمان زیاد بوو بـە دەرۆزەکەرانم بەخشی » • مەلا

---

(3) Jabe, Recueil, C., P. 15.

بەم قسانە زۆر تووڕە بوو ، هاواری کرد : « کچێ حورمێ ، وەعزەکانم بۆ نوێژکەران بوو نەك بۆ خۆم • ئاخر کە ئەم جۆرە وەعزەی خەڵك دەدەم بۆ ئەوەمە چی جلوبەرگ‌و نانی زیادیان هەیە بە منی ببەخشن • قەت نەدەبوو تۆ بیرت بۆ چواندنی شەمەك‌و نانی منداڵەکانم بچێ • من بۆ پەرژەوەندی خۆم وەعزی خەڵك دەدەم ، کەچی تۆ لەسەر حیسابی من جێبەجێی دەکەی » •

کورد ئەم چیرۆکە ڕەمزیەش لە بارەی هەمان بابەت دەگێڕنەوە :

## پێغەمبەرو فریشتە(٤)

کاتێ کە پێغەمبەر ـ د•خ ـ بەرەو بەهەشت هەڵکشا ، جوبرائیلی سەرۆکی فریشتان ڕابەری بوو عاجباتی عاسمانانی پێشان دەدا • پێغەمبەر ـ د•خ ـ فریشتەیەکی کەتەو زلی بینی لە شوێنێکی بڵند وەستا بوو ، دەهۆڵێکی گەورەی بە شانەوە بوو ، داردۆڵێکی درێژی بە دەستەوە بوو • پێغەمبەر ـ د•خ ـ لێی پرسی داخۆ کێیەو چ کارەیە • فریشتەکە وەڵامی دایەوە : « ئەی پێغەمبەری خودا • من فریشتەم‌و ئەرکی من ئەوەیە کە مەلایەك خێرێك بکا یان زەکات بدا یان هەر هیچ نا پاروەنانێك بداتە دەرۆزەکەرێك دەهۆڵەکەم بکوتم‌و باسی خێرو چاکەی مەلا بە هەموو فریشتەکانی ئاسمان ڕابگەیەنم » • ئینجا پێغەمبەر ـ د•خ ـ لە فریشتەکەی پرسی : « باشە ، لەوەتی ئەم فەرمانەت پێسپاردراود چەند جار دەهۆڵەکەت کوتاوە ؟ » فریشتەکە وەڵامی دایەوە : « هیچ ، هەروا چاوەڕێم ، تا ئێستا تەقەم لێ هەڵنەستاندود » •

---

(4) Jaba, Recueil, & c., P. 15.

ئاخۆ هەتا هەتایە ئەم فریشتەیە هەروا دەمێنێتەوە ؟ هەر خوا خۆی دەزانێ • لە هەموو ئاینێکدا پیاوی ئاینی زۆربەی ئەرکی دین بە جێ دێنن بەڵام چاکەو خێریان کەمە • خێرو زەکات لە خەڵك وەردەگرن بەڵام خۆیان هیچ بە هەژاران نابەخشن •

× × ×

دیارە ئەو سۆفییەتە ئاڵۆزەی زۆر بە چڕی تێکەڵی باوەڕی نافمی سیعە بوە کە ئێران باوەڕیان پێ هەیە ، لای کوردە چیاییەکان سیحرێکی مەزنتری تێدایە لەو بڕوا سامییەی کە دەڵێ خوا بێ ئاوقەرانو بێ هاوتایەو عوسمانلییە سوننییەکان باوەڕیان پێ هەیە • هەر بۆیەشە دەروێشی ، کە سۆفیگەری ئیسلامەتییە ، لەناو کوردا بوی هەیە • ئافرەتی کورد لە ئافرەتی تورك زیاتر ڕێزو حورمەتی شێخ یان خۆیان گوتەنی «پیر» دەگرن ، چ زیندوو چ مردوو • چونکە چۆن کورد بەرامبەر بە باوەڕی ئیسلامەتی کەمتەرخەمن هەر بەو جۆرەش وەکو هەموو چیاییەك زیاد لە پێویست ئەفسانەیینو باوەڕی پتەویان بەو هەموو هێزە روحیو سیحرییە هەیە کە شێخە دەروێشدارەکان داوای دەکەن •

شێخ خالیدی خوالێخۆشبووی سلێمانی پیرێکی بەڕێزو پایەبڵندە لەناو کوردان و کورد ئەگەر بە ئاوقووفی محەمەدی پێغەمبەریشی دانەنێن ، بە ئاوقووفی شێخ عەبدولقادری گەیلانی(٥) دادەنێنو لەو بڕوایەدان ئەگەر بێجگە لە (حەزرەتی مەولانا -

---

(٥) دەرویشێکی بەناوبانگە • لە سەدەی دوازدەمدا ژیاوەو تەریقەتی قادری داهێناوە • زۆر چیرۆکی سەیر هەن باسی هێزی بەدەرئاسای ئەم شێخە دەکەن ، کە هەندێکیان لەم کتێبەدا هەن :
The Dervishes, by. J. P. Brown.

Hasrati Maulana )به هەرچی جۆرێکیتر ناوی بێنن گوناحیان دەگاتێ • ئەم (پیر)ەی کوردان ، کە کورد قسەکانی بە « حەدیس ـ Hadis »[٦] دادەنێن سەر بە تەریقەتی نەقشبەندی‌یە • نەقشبەندی تەریقەتێکی خواناسی‌یەو بە تەقوای سۆفیانەی مریدەکانی بەناوبانگەو لە دونیای ئیسلامەتی‌دا ، زۆر پیری گەورەی لێ‌هەڵکەوتوە •

ئافرەتی کورد بۆ چارەکردنی نەخۆشی بەدەن‌و دەروون دەچنە سەر گۆڕی شێخی مردوو یان (تەکیە)ی[٧] شێخی زیندوو • ئەگەر منداڵێك نەخۆش بکەوێ ، دایکی هەراسانی دەیباتە لای نزیکترین شێخی بەناوبانگ ، ئەویش نەك هەر دەستی پێدادێنێ ؛ بەڵکو پێی لێ‌دەنێ یان فووی لێ‌دەکا یان هەندێ نوشتەو کشتەکی پیرۆزی بە ملی بچووکەوە دەکا • پێ‌لێ نانەکە لە هەمووی ترسناکترە ، کە بە ڕاستی هەیەو من بە چاوی خۆم دیومە[٨] • منداڵەکە لەسەر پشت درێژ دەکەن‌و دوو دەروێش لەم‌لاو لەولای دەوەستن‌و شێخ دەست دەخاتە سەرشانیان و پێ‌داوێتە سەر لەشی منداڵەکەو بۆ ماوەیەکی کەم هەموو گرانایی خۆی دەخاتە سەر منداڵەکە •

شێخەکان خەونیش لێك‌دەدەنەوەو بەختیش دەخوێننەوەو هەر زانیاری‌یەکی‌تری ئەفسوونی کەخەڵك پێ‌یان‌بوێ بڵاوی دەکەنەوە •

هەندێ (پیر)ی ئەرمەنیش هەن کە کوردی خێڵەکی زۆ ڕێزیان

---

(٦) موسلمان ئەم ووشەیە (حەدیس) بۆ فەرموودەکانی پێغەمبەر بەکار دێنن •

(٧) تەکیە : شوێنێکە دەروێش لێی‌کۆدەبنەوەو زیکرو تەهلیلەی تێدا دەکەن •

(٨) ئەمەم لە (سالۆنیکا) بینی ، لە خزمەت تەکیەی مەولەوی‌یان وەکو ئەوروپیی دەڵێن : دەروێشی سەماکەر •

دەگرن • وا دەبێ داوای هیمدادو یارمەتی لە سورپ سیرکیس یان سانت سێرگیوز دەکەن • جەنگاوەرانی کورد پێش ئەوەی بۆ شەڕو هێرش بەڕێ بکەون دەچنە سەر گۆڕیو بەرانی بۆ دەکەنە قوربانیو مۆمی بۆ دادەگیرسێنن بۆ ئەوەی فریایان بکەوێو چەپاڵەیان بدا •

ئەفسانەی سەیرو سەمەرەی خدرەلیاس لەناو کوردانیش‌دا هەیە، کە شەخسیەتێکی یەزدانی دوولانەی دەشتو دەریای هەیە • لای کورد ، لە دەشت خدرەو لە دەریا ئەلیاسە ، وەکو جۆرە فریشتەیەکی خێرخوا وایەو خەڵك فریادو هیمدادی لێ‌دەخوازن •

کورد وەکو نەتەوە دراوسێکانی‌تریان بڕوای تەواویان بە (جن ــ djin )و مەخاووقاتی خەیاڵی هەیە ، سەرباری ئەمەش جۆرە تاپۆیەکی‌تری ئەودیو سروشت هەیە پێی دەگوترێ « شەهید ــ Sheyt » ترس‌و خۆف دەخاتە دڵی ئەم چیایانەوە • ئەمانە تاپۆی شێخان نین ، هی شەهیدانن • شەهید ئەو موسلمانەن کە لە ڕێی ئیسلامەتی‌دا کوژراونو دەڵێن گۆڕیان وەك گۆڕی شێخان موعجیزەی لێ ڕوو دەدا • گوایە ئەمانە لە گۆڕ دێنە دەرێو خۆیان پێشانی خەڵك دەدەنو کە بە کۆمەڵ دەربکەون نیشانەی ئەوەیە ڕوداوێکی گرنگ لە دواڕۆژدا دەقەومێ • دیارە کورد بە پێی ڕەوشتی خۆیان شانازی‌یان پێوە دەکەنو بە جۆرە کۆچەری‌یەکی گۆڕاوی وەکو خۆیانی دەزانن •

یەزیدی یان (شەیتانپەرست)* کە باسم کردن و گوتم لە بارەی

---

* بەداخەوە زۆربەی ڕۆژەلاتناسەکان کە باسی یەزیدی‌یانیان کردوە بە (شەیتانپەرست) یان داناون • ڕاستی ، یەزیدی شەیتانپەرست نین ، خواپەرستن ، بەڵام ڕیزی شەیتان (مەلەکێ‌تاووس) دەگرن بۆیە ئەم ناوەیان بە دوو کەوتووە • (وەرگێڕ) •

داب‌و دەستووری زەماوەندو جەنازەوە لە کوردە موسلمانەکان جودان ، برینین لە هەشت نۆ خێڵی جۆر بە جۆرو هەندێ کۆچەرو هەندێکی ناکنجی • ئەو نەفرەتەی موسلمان لێیان کردوون نیشانەی ئەوەیە کە دامەزرێنەری ئەم ئایینەو یەزید لێکەوە نزیکن ، ئەو یەزیدەی کە حەسەن‌و حوسێنی شەهیدی پایەبەرزی ئیسلام‌و کچەزای پێغەمبەری کوشتون • لەگەڵ ئەوەی کە ئەمانە زۆر پێش سەدەی حەقدەم ئەو ناوەیان لێ بوە •

(یەزد) یەکێ بوو لەو ناوانەی فارسە کۆنەکان بۆ خوا بەکاریان دەهێنا • بەلای مستەر (باجەر)ەوە[9] ، ناوی شێخ ئادی کە پیرێکی ڕوحانی‌یەو مەزارەکەی ڕووگەی سەرەکی یەزیدی‌یانە ، لە عیبری‌یەوە هاتوە • (ئاذ) یان (ئاد) دوو پیتی پێشەوەی ووشەی (ئادونا)یە کە مانای خوا دەگەیەنێ ، هەڵبەت ئەمەش جێی دەمەتەقێیە • بەلای یەزیدی‌یانەوە ، شێخ ئادی نوێنەری هێزی چاکەیەو بەرامبەر بە « شەیتان – Sheitan » دەوەستێ کە هێزی خراپەیە • دەڵێن یەکەمیان ئەوەندە چاکەخوازە پێویست ناکا ناوی بێنی یان بیپەرستی ، دوەمیشیان کە هێزی خراپەیە ، هێندە خراپ‌و بەدکارە دەبێ بەردەوام ڕازی بکەی ، بۆیە لە ترسانە کە شەیتان دەپەرستن نەك لە خۆشەویستی‌یان و ئەو قوربانی‌و خزمەتەی لە شەرافەتی ئەوەوە دەکرێ هەمووی بۆ ڕازی‌کردنە نەك بۆ قوربانی خۆشەویستی‌و پیرۆز • ڕاستە ، ئەوەندە لێ‌یدەترسن هیچ ووشەیەکیان بەسەر زاردا نایە کە لەعنەتی تێدا بێ ، یان دەنگێکی وای تێدا بێ لە ناوی ئەو بکا • ئەو ئەفسوونەی وەك تریاك دژی کردەوەی شەیتان بەکار دێ

---

(9) The Nestorians, & c.,

ئۆرکی ڕازی کردنی پێوەیە • یەزیدی کوڵوکە خەشخاش بە ڕەمزی قوربانی دادەنێن چونکە ڕەنگی قورمزی‌یە ، جا بە زۆری لە بەرۆکی خۆیانی دەدەن یان بە چەپك هەڵی‌دەگرن‌و لـە ئاهەنگیش‌دا دەرگاکان بە شریتی ئەم گولەجوانە دەڕازێننەوە •

مەرایی هۆیەکە لە هۆیەکانی ڕازی کردنی هێزی خراپە ، هەر بۆیەشە ناویان لە شەیتان ناوە « مەلەك تاوس – Melek Taos » واتـە تاوسی پاشـا ، یـان فریشـتەی جوان وەك تـاوس ، هـەروەهـا پێشی دەگوترێ (میری مێروولان) • مەلەك تاوس پەیکەرێکی ڕەمزی هەیـە لـە شـێوەی باڵندەیـەکـی سـفردایـەو وەرزاو وەرز بـە ناوچـە یەزیدی‌نشینەکان‌دا دەیگێڕن • دوو (پیر) پێـش ئـەم بـاڵنـدە پیرۆزە دەکەون ، بخووریان بە دەستەوەیە دووکەڵی لێ‌هەڵدەستێ‌و خەڵکەکە ئەم دووکەڵە بە دەست‌و چاویان دادەکەن • کاتێ کە ئەم «سەنجەق ـ Sanjak »ە دەگاتـە ناو گوندێك یـان ناو هۆبـەیـەك ، شـەرەفی وەرگرتن‌و پاراستنی دەدرێتـە گـەورەترین ئـاغاو دوو ڕۆژ لـەوێ دەمێنێتەوەو لەو کاتەدا هەموو بەزم‌و ئاهەنگێکی دونیایی قەدەغە دەکرێ• ئەم پەیکەرە ڕەمزی‌یە وەکو کەلەشێر وایە : سنگ‌پڕ ، سەربچووك ، کلك‌فش ، گۆشتن ، کلك‌ئەستوورو گرێچن ، ژێر دەنووك شۆر وەك غەبغەب • مۆمێك لەسەر ترۆپکی چەقاوەو لەژێرەوەش دوو حەوزی زەیت لە دەواندەوری بنکەکەی هەن ، هەر یەکە حەفت فتیلی پێوەیە • ئەمە هەمووی لە سفرەو بـە جۆرێکی وا دروست کراوە بـە سـانایی پارچەکانی لێك دەردەهێنرێن • خاتوو ماجـەڕی ژنی مستەر ماجـەڕ ئەو ماوەی لـەناو یەزیدی‌یان بوە توانیویە لـە کاتـی بێ‌ئیشی‌دا بچێتـە ژووری مەلەك تاوس‌و لە نزیکـەوە لێی وورد بێتەوە • حەوجۆشێك

لەسەر سەکۆکە ، لە تەنیشت پەیکەرەکەیە[10] بۆ چارەسەری ئازارو نەخۆشی بەکار دێ • سەری یەزیدو حوسێن بەگو هەندێ پیرو قەووالو نەقیرێکی لێیە • بەو خێرە هەڵدەدەن کە لە کاتی سەنجەق گێراندا لە دیانو موسلمانو یەزیدییان وەریدەگرنو و بانگی خەڵك دەکەن بۆ ئەوەی پەیڕەوی ئەوان بکەن •

حەفت کەڵەشێری سفر ، بە سەرپەرشتی پیرنەزەر کە کاروباری گێرانەکە هەڵدەسووڕێنێ ، بەناو یەزیدییاندا دەگەڕێ • (حەفت) ژمارەی پیرۆزی یەزیدییانە[11] •

زۆر دابو دەستووری ئایینی یەزیدی هەیە وێ دەچێ پاشماوەی زەردەشتی یان باوەڕی سابیەکان بێ کە بە زانستیی کلدانیو بە چەکی ئاسووری لە ئاسیادا بڵاوبوەوە • لەبەر ئەوەی یەزیدی کوردنو کوردیش وەك لە پێشەکییدا باسمان کرد لەوانەیە جێگری کلدانیان بن ؟ جا بۆی هەیە یەزیدیش هەروا بن •

بەلای یەزیدییەکانەوە ، ئاگرو ڕۆژ نیشانەی «یەزدەن کە هێزی چاکەیە ؟ بۆیە یەزیدی قەت تف لە ئاگر ناکەنو شتی پیسی فڕێ

---

(10) The Nestorians & c., P. 123.

(11) لایارد(Sir. H. Layard) لە کتێبەکەیدا (نەینەواو پاشماوەکانی Nineva and its remains)دا وێنەی برۆنزێکی داوە کە لە نمرود دەرهێنراوە بریتییە لە باڵندەی پیرۆز و چوار سەرباز لە کوڕەوێکدا هەڵیانگرتوە • دەڵێ : (ئینج ـ The Iynge) یان باڵندەی پیرۆز بۆ ئایینی بابلی دەگەڕێتەوە و ڕەنگە هی ئایینی ئاسووری بێ ...
جۆرە ئەهریمەنێکە کاریگەرێکی تایبەتی لەسەر بنیادەم هەبوەو لە (فروهر ـ Frouher ) ی سستەمی زەردەشتی دەکا •
بەرگی ٢ ، ل٤٦٢ ـ Vol. II. P. 462

نادەنە ناو ، بەڵکو دەستو چاویان بە هەڵمی هاڵاوی ئاگر تفەڕك دەکەن بۆ ئەوەی پاك ببنەوە • کە ڕۆژ هەڵدێو ئاوا بێ ، پیاوە ئاینییەکان دەیپەرستن ئەویش بە داهاتنەوەو ماچ کردنی زەوی یان بەردێك کە پاشان لەسەر بەردێکیتری دادەنێنو جێی ناگۆڕن • ڕەشەوەندی خەڵکیش ئەم ڕیزو حورمەتە بۆ ڕۆژ دەنوێنن بەڵام تەنیا لە کاتی ئاهەنگو حەجدا • لە کاتی ڕۆژ ئاوابووندا ، لەبەر دەرگای هەموو « چاك ـ Shak »و مەزارێكو لە نزیك هەموو کانییەکدا چرا دادەگیرسێنن ؛ چونکە ئاو ڕەمزی هێزی چاکەیە • ماسیش پیرۆزەو تەنیا چینی خوارەوەی کۆمەڵ بەروبوومی ئاویە دەخۆن • دابی مەعموودیەت زۆر دەکەنو پێدەچێ جۆرە شوشتنەوەیەکی وەسەنیەت بێ لە جۆگەو کانی پیرۆز پێش بەشداری کردنی دەستووری ئاینی خۆیان •

یەزیدی گەلێ ڕیزی ڕەنگی شین دەگرنو قەت کەلو پەلیان شین ناکەن ، جا چ جلوبەرگ بێو چ کەرەستەی ناوماڵ • خواردنی خاسو کەلەم لە یەزیدییان حەرامە • یەزیدیش وەك موسلمانان زۆر ڕیزی « عیسا ـ Isa » دەگرنو شەراب بە ڕەمزی خوێنی عیسا دەزانن • کە شەراب دەنۆشن بە هەردوو دەست بادەکە بەرز دەکەنەوە بۆ ئەوەی نەڕژێ ؛ چونکە ئەگەر دڵۆپێکی بڕژێ دەڵێن کابرا دەبێ بە لێو لەسەر عەرد هەڵیبمژێ و ئەو خۆڵەش بخوا کە شەرابەکەی تێکەڵ بوە • ڕاستی ، دەڵێن ، یەزیدیو کوردی تایەفی هێندەی موسلمانان دژی دیانان نین • هەر چەندە کە قەت ناچنە کلیسەی ئەرمەنییان بەڵام زۆرجار وا دەبێ کە بەلای کلیسەیەکدا تێدەپەڕن هەڵوەستە دەکەنو دوعا دەخوێننو دەپاڕێنەوە •

جۆرە دانپێدانانو کەفارەتێکی سەیر لەناو ئەم (بێئیمان)انە

هەیە • پیاوەکان جۆرە برایەتی‌یەك لەناو خۆیاندا پێك دێنن‌و بە ڕێکەوت یەکێ لەناو خۆیاندا هەڵدەبژێرن‌و دەیکەنە قۆچی قوربانی • جا هەر کەسە تاوانێکی زلی کرد بێ بە ئاشکرا بەمەیان دەڵێ‌و ئەمەیش لە باتی ئەو کەفارەتەکە دەدا کە نوێژکردن‌و ڕۆژووگرتن‌و ڕیازەکێشانە ، بەرامبەر بەمەوەش ، ئەوان پشتی دەگرن‌و یارمەتی دەدەن‌و هەموو ئەرکی دونیایی بۆ جێ‌بەجێ دەکەن و مەڕو ماڵاتی بۆ بەخێو دەکەن‌و خێزانی بۆ بەرێوە دەبەن •

یەزیدی پایەی ئایینی‌یان جودایەو بە گشتی دەکرێنە دوو چین ، ئەم دوو چینە هەتا هەتایە لێك جودان‌و ژن نادەنە یەك • پێشەوایی پیرنەزەر یان پیری گەورە لە ناو یەك خێزاندا بە پشتاو پشت دێتە خوارێ‌و بە گشتی بۆ کوڕی گەورە دەبێ • ئەم پیرەش وەك شێخی ئیسلامان بڕوای وایە کە هێزی لەو دیو سروشتەوە بۆ دێ • بۆ چاككردنەوەی نەخۆشی بێ‌ئامانی بنیادەم و ماڵاتو بۆ بەخێر گەڕانی سەفەرو سەرکەوتنی پرۆژەو زۆر شتی تریش ، نەك هەر یەزیدی بگرە موسلمانیش هیمدادو یارمەتی لێ‌دەخوازن‌و خۆی دەخاڵەت دەکەن • جارێکیان پیری موبارەك چارەی برینێکی زۆر سەیری ژنە یەزیدی‌یەکی کرد کە مێردی بە موسلمانێك کرد بوو • ژنە پێشتر چووبوە لای مەلاو «حەکیم – Hekim » ، بگرە سەری لە نوژدارویەکی فەرەنگیش دا بوو •

چیرۆکەکە دەڵێ : شێخ داوای لە مێردی ژنە کرد مەڕێك بکاتە قوربانی‌و هات خوێنەکەی لە هەنیەی ژنە ڕشاند ، ئینجا دەستە قوڕێکی ڕەقی لەسەر سنگی دانا کە لەسەر مەرقەدی شێخ ئادی هێنابوویان • داوێکی لە زەندەی چۆپەی ژنە بەست‌و حەفت ڕۆژ بە تەنیایی خستی‌یە

زوورێکەوەو لەو ماوەیەدا تەنیا جۆرە نانێکیان دەرخوارد دەدا کە شێخ بە دەستی خۆی دەیکرد • مێردی ژنە سەری زۆر لە سەرکەوتنی ئەم چارەکردنە خەرافی‌یە سوڕماو پاشان بۆ مەلای گێڕایەوە کە نەیتوانی بوو چارەی بکا ، مەلا گوتی : « ئەدی نەیانگوتوە پیسی بە پیسی دەچێ ؟! » •

وێ ناچێ یەزیدی هیچ کتێبی پیرۆزیان هەبێ* • ئەو ویردەی لە نوێژ دەیخوێنن نەوە بە نەوە و زار بە زار هاتۆتە خوارێ • ئەمەش هۆیەکە لەو هۆیانەی ڕێ بە موسلمانان دەدەن کە خراپە بەرامبەر یەزیدی‌یان بکەن ؟ چونکە قورعان دەڵێ ئەو کەسانەی (خاوەنی کتێب) نەبن – واتە وەحی نووسراویان نەبێ – شایەنی نەفرەت‌و سووکی‌و ئازاردانن • ئەو دوژمنداری‌یەی کە موسلمان کردوویانە بە تایبەتی چینی «عولەما» ، هەندێ جار بۆتە هۆی تۆڵە سەندنەوەی وا کە مەلاکان هەموو جارێ نەتوانن وەکو مەلای ناو ئەم چیرۆکەی خوارەوە بە موعجیزە لە گرتن‌و مردن دەرباز بن •

## مەلا محەمەدی قولپی(۱۲)

ڕۆژێ مەلا محەمەدی قولپی هەگبەیەك کتێبی بە پشتی داداو شیرو مەتاڵی لە خۆی بەست‌و بە تاقی تەنێ ڕێی بایەزیدی گرتە بەر بۆ ئەوەی لەوێ دەرز بلێتەوە • لەو کاتەی کە لە دەشتی عەبباغا

---

* دیارە خاتوو گارنێت ناوی (مەسحەفا ڕەش) و (جەلوەی) نەبیستوە کە کتێبی پیرۆزی یەزیدی‌یانن • هەر چەندە کە من لەو بڕوایە دام کتێبی ئەسلی یەزیدی‌یان زۆر لەم دوو کتێبەش کۆنترەو هێشتا بە تەواوی زمان‌و ئەلفو بێ‌و ناوەڕۆکەکەی ساغ نەکراوەتەوەو بە تەواوی لێی‌نەکۆڵراوەتەوە • (وەرگێڕ) •

(۱۲) قولپ : گوندێکە کەوتۆتە بەینی بتلیس‌و سەعرەت •

دەرۆشت کەوتە ناو کەفرو تیوەڕە تەمۆخان ، لەناکاو هـەشت سواری یەزیدی لە بۆسە لێ‌ی‌دەرپەڕینو گرتیانو قۆڵبەستیان کردو هـەرچی پێ‌ی بوو لێ‌یان سەندو بردیانە مەکۆی خۆیان بۆ ئەوەی لەوێ بـە دەردەسەری بیکوژن • پیری یەزیدی‌یان شیری هەڵکێشاو لەسەر سەری مەلا ڕایگرتو گوتی : « وەرە ، واز لە دینی محەمەد بێنەو ببە یەزیدی، نەوەك دەتکوژم » • مـەلا وەڵامـی دایـەوە : « خوا بـە زارت دا نەنۆڕی ، ئیشی وا ناکەم ! ئەگەر دەمکوژی بمکوژە ، دیارە خوا وای نیاز لەسەرە ، منیش بە ئەمری خوا ڕازیم » • یەزیدی‌یەکە پێ‌ی گوت: « ئەگەر بڕوات بە هێزە کە دینەکەت ڕاستە فەرموو وا بکـە محەمەد بێتە هاناتو لە مردن قوتارت بکا » • مەلا وەڵامی دایەوە : « محەمەد هەر ناشزانێ من لێرەم » • ئینجا یەزیدی‌یەکە گوتی : « باشە ، دە بانگی محەمـەد بکـە بەڵکو بێ‌و لەبـەر دەستی من دەرتبێنێ‌و ڕەهات بکا » • هەڵبەت.پیری یەزیدی تیزی بە مەلای کلۆل دەکرد ، بۆیـە پێ‌ی گوت : « پێش ئەوەی بتکوژم سێ جار بە دەنگێکی بەرز هاواری محەمەد بکە ! » مەلا بـە نائومێدی سێ جار ، بـە دەنگی بـەرز ، هاواری پێغەمبەری کرد : « یا محەمەد ، یا محەمەد ، یا محەمەد ! » بە ڕێکەوت لەو کاتەدا ، کابرایەکی محەمەد ناو ، کـە لە عەشیرەتی حەیدەرانلی بوو ، بە خۆو بە دە سواران بەوێدا تێ‌دەپەڕین ؛ کـە گوێ‌یان لەم هاوارە بوو تەقلەکوت هاژوایانە ناو کەفرەکانو یەکسەر گەیشتنە سەر هەشت یەزیدی‌یەکەو مەلای یەخسیر • یەزیدی کـە گوێ‌یان لە ڕمبەی سمی ئەسپان بووو دیتیان ئەم هـەموو سوارە لـە هیکەوە لێ‌یان پـەیدا بوون ، قوچاندیانو هەڵاتن • حەیدەرانلی‌یەکان بەریان دا دوویانو چواریان لێ‌گرتنو هەر لەوێ دەستبەجێ کوشتیانن، بەڵام چوارەکەی‌دی دەرباز بوون • کـە بەم جۆرە مـەلا محەمەدیان

ڕزگار کرد ، دەستو پێیان کردەوەو لێیان پرسی داخۆ چۆن کەوتۆتە بەر دەستی ئەو یەزیدی‌یانە • مەلا چی بەسەر هاتبوو هەمووی بۆ گێڕانەوە • ئەوانیش لەو ئەسپانەی گرتبوویان ، ئەسپێکیان دایێو ئازادیان کرد • مەلا بە ساغو سەلامەتی گەیشتە بایەزیدو ئیدی لەوێ باس هەر باسی مەلا محەمەد بوو •

× × ×

یەزیدی ڕۆژمێری محەمەدی‌یان هەیەو وەکو موسلمانان مێژووی کۆچی بەکار دێنن • جەژنی سەری سالیان دەکەوێتە ڕۆژی چوارشەمە* کە یەك شەمووی ئەوانە بەلام بۆ ڕاگرتنی دڵی موسلمانە دراوسێکانیان وا دەردەخەن کە ڕۆژی پیرۆزو پشوویان رۆژی هەینی‌یە • هەر چەندە کە ڕۆژوو لەگەڵ بیروباوەڕی یەزیدی‌یان پێچەوانەیە بەلام هەموو سالێ لە مانگی کانوونی یەکەمدا سێ ڕۆژ بە ڕۆژوو دەبن •

ئابیدەی یەزیدی‌یەکان کە مەزاری شێخ ئادی‌یە هێندەی شتی تایبەتی‌ی بیناسازی‌و ڕازاندنەوە تێدایە کە بە وەسفێکی کورت هەقی خۆی نادرێتێ • ئەم مەزارە کەوتۆتە دۆڵێکی ناو شاخان ، بیست میل لە خوارووی ڕۆژهەلاتی (ڕەبان هۆرمەزد)ە • ئابیدەکە ڕۆژهەلاتو ڕۆژاوا هەڵکەوتوەو زۆر وێنەی لە دیوارەکانی ناوەوە کراوە وەك : خاتەمی سولێمان ، گۆڵ ، گۆپاڵ ، تەور ، سۆلجانی حەفت چڵ ، شێر ، مارو زۆر زیندەوەری تریش • ڕووبارێك بە ژێر عەردی

---

* ڕۆژی پیرۆزو پشوو ، لای موسلمانان هەینی‌و لای دیانان یەكشەمەو لای جولەکان شەمووو و لای زەردەشتی‌و یەزیدی‌یان چوارشەمە • (وەرگێڕ) •

ئابیدەکەدا دەڕواو لە حەوشەدا حەوزێکی لێپڕدەبێ • کانی یەکی پڕ ئاویش لە هۆڵی سەرەکی‌دا هەیە کە هەر گۆشەیەکی سەکۆیەکی بچووکی لێ‌کراوە بۆ حەسانەوەی ئەو کەسانەی دەچن لەوێ لە ئەو بکەون • ئابیدەکە سێ گۆڕی تێدایە ، دەڵێن گۆڕی شێخ ئادی‌و دوو پیری‌تری یەزیدی‌یان‌و هەر گۆڕەو گومەزێکی قووچەکەیی بەرزی وەکو لووتکەیەکی تیژی لەسەر قیت بۆتەوە • دووریش نی‌یە ، ئەوانەی بە گۆڕ داندراون ، تەنیا گۆڕی ڕەمزی بن‌و یەزیدی بۆ ڕاگرتنی دڵی موسلمانە دوژمنەکانی دەوروبەیان دایانهێنا بێ • پەنداقێکی نزیك گۆڕی سەرەکی قوڕی لێ‌یەو حاجی بە تفەڕك دەیبەن‌و بۆ نووشتەو شتی وا بە کاری دێنن ، هەڵبەت لەمەدا لاسای موسلمانان دەکەنەوە کە خۆڵی سەر گۆڕی شێخە گەورەکان(١٣) بە تفەڕك دەبەن • نزیکەی هەموو گوندە یەزیدی‌یەکان چاکێك یان گۆڕێك‌و بگرە پتریان لێ‌یە دەڵێن گۆڕی پیرێکی گەورەیەو هەموویشیان بریتین لە هۆڵێکی نزمی چوار گۆشەی بچووك‌و چەند دالانێکی نزم‌و گومەزێکی قووچەکەیی قیت • ئافرەت‌و بگرە پیاویش لەسەر مەزاری شێخ ئادی مجێوری دەکەن • ئافرەتەکان کراسی سپی لەبەر دەکەن‌و چەفتەی سپی لەسەر دەنێن • یەزیدی ساڵێ دوو جارە دەچنە حەجی ئەم ڕووگە پیرۆزەیان‌و لەو ناوە هەوار هەڵدەدەن‌و لەناو دۆڵ‌و باخچەکان‌دا بەو پەڕی شادی‌و خۆشی‌یەوە دابی ئایینی خۆیان بەجێ دێنن • ئافرەت بەرگی پۆشتەو پەرداخ لەبەر دەکەن‌و خەناوکەی زیو لە مل دەکەن

---

(١٣) دەروێشی مەولەوی کە کلیلەکانی گلیسەی سانت دیمیتریۆسی لە سالۆنیکا لایە ، ئەو کاتەی چووینە سەردانی هەندێ قوڕی ژێر گۆڕی ئەم چاکەی دامێ کە موسلمان‌و گریك بە تەد یەك ڕیزی لێ‌دەنێن •

دراو لەسەر دەنێن‌و پەڕی قورمزی‌و چەپکە گوڵ یان کوڵووك
خاشخاش لەبەر قێس ڕادەکەن‌و لەگەڵ پیاوان شایی ڕەشبەڵەك دەکەن‌و
جاری وا هەیە ژمارەی شایی‌کەران دەگاتە دوو سەد کەس • زۆربەی
کچی عازەب ئەو وەختە ، بەو پەڕی دڵەوە ، بە شایی‌و خۆشی ،
لەگەڵ دڵخوازو دەزگیرانیان ڕادەبوێرن •

خێڵی گەورەی (دوجیك)ی کوردی کە چەند تایەفەیەکە جۆرە
مەزەبێکی تایبەتی‌یان هەیە پێی دەگوترێ «کزڵباخ»** • ئەمانە عەلی‌ی
خەلیفەی یەکەم* بە لەشی خوا دەزانن‌و بەم جۆرە وەکو عەلی
ئیلاهی‌یەیان ئێران پایەی عەلی لە پێغەمبەری موسلمانان گەورەتر
دادەنێن • تایەفەیەکی‌تریش هەن پێیان دەگوترێ « بالیکی ـ
Baliki » ئەمانە وا دادەنێن کە عەلی دوا دەرکەوتنی خوایە لە
شێوەی بنیادەمدا • سۆفی‌یە سەرگەرمەکانی موسلمانان دەڵێن ئەو
هەموو پێغەمبەرە گەورانەی کە هەر لە سەرەتای دروست بوونی
دونیاوە دەرکەوتوون ـ ئادەم ، ئیبراهیم ، مووسا ، ئەلیاس ، عیسا ،
محەمەد ـ هەموویان یەك لە دوای یەك لەشی خوا بوون‌و لەبەر
ئەوەی دامەزرێنەری ئیسلام لە پاش هەموویانەوە هاتوە لە هەموویان
پایەبەرزترو گەورەترە • بەڵام بالیکی‌یەکان بە تەواوەتی ئینکاری
محەمەد دەکەن • بینا بە قسەی ئەوان : « خوا خۆی بە هەزار جۆر
نیشان داوە • بەڵام زۆر کەس بڕوایان وایەو هەیشە گومانی هەیە کە
حوا خۆی بە یەك شێوە پیشان بدا » • هەر چەندە پیاوەکانی سەر
بەم تایەفەیە شەڕکەرو سەرکێشن بەڵام ئەم وەفدە ئەمەریکی‌یەی هاتە
ناویان بە سەرکەوتوویی دەرچوون • کاریگەری ئەم چەند

** ڕەنگە قزڵباش بێ • (وەرگێڕ) •
* عەلی چوارەم خەلیفەیە • (وەرگێڕ) •

نۆیۆرکی‌یە ئەوە بوو کە توانیان هەندێکی هەرە چەتوونو گێرەنێوێن ڕازی بکەن کـە چەك فرێ بدەنو واز لە خراپەکاریو چەتەگەریو دزیو کوشتنو بڕین بێنن ، کە تورك قەت نەیدەتوانی کاریان تێ بکەنو بیانگۆڕن(١٤) .

---

(١٤) بڕوانە :

(14) Consul Taylor, Jour.R. Geog. Soc. vol. P. 29.

کە دەڵێ : بالیکی Baliki دەڵێن گوایە نەوەی «شارەزوور» یان «سانەسەر»ی «سەنحاریب»ن کـە لەگـەڵ «ئەدریمالەك»ی برای هەڵاتن بۆ «ساسوون» کە کەوتۆتە خوارووی ڕۆژهەڵاتی گۆلی وان ، دوای ئەوەی کە لە نەینەوا باوکی خۆیان کوشتو سێ سولالەیان دامـەزراند یەکێکیان ئـەوەی «سەناسوون» یان «ساسوون»ەکان بوو . بڕوانە ئەمانەش :

Moses of Khornî, I, P. 103. II. P. 145.

هەروەها :

The Georaphy of the Vartabed Vardan in St Martin, II. P. 431.

کە تایلەر باسی کردوە .

# بـەشی چوارەم

## ئافرەتی کورد : داستان‌و چیرۆکی فۆلکلوری‌یان

ئـەو چیرۆك‌و ئـەفسانانەی کوردە دەیگێڕنـەوە مۆرك‌و شـێوازو نیشانەیان تەواو تایبەتی‌و جودایە • زۆر ئەفسانەیان هەیە کە هەندێ زۆر لە هەقایـەتی خۆش‌و سوودبـەخشی گریکی‌و تەوتۆنی یان لـە چیرۆکی گیانداران دەچن کـە ڕەنگـە هـەر لـە کۆمەڵە چیرۆکەکانی ئیزۆپ‌و لافۆنتێـن‌و فابلیـسـتەکانـی‌دی بـن‌و مۆرکـی ڕۆژەڵاتـی‌یـان وەرگرتبێ •

چیرۆك هەیە باسی خەزینەی پاشا دەکا کە جن پاسەوانی دەکەن ، هەیە باسی ئـەشق‌و ئەوینی بـە سۆز دەکا • جگە لەو ئەفسانە لـەبن نەهاتوانەی کە باسی پاڵەوانێتی خێلایەتی و دەرەبەگایەتی‌و تۆڵەسەندنەوەی مەردانە دەکـەن • چیرۆکی تۆڵەسەندنەوە هـەر چـەندە بە هـەموو مانایەکەوە چیرۆکی فۆلکلۆری نی‌یە ســەڵام زۆر بـە ووردی وەسفی ڕەفتارو کردەوەی ئەم گەلە کێوی‌یە سەرسەخت‌و تایبەتی‌یە دەکا کە من زاتم کردوە یەك دوانێکیان بخەمە ناو ئەم بەشەوە •

× × ×

چیرۆکی یەکەم ئاشـکرا دیارە چیرۆکی (کۆنستانت‌و دێو)[1]ی فۆلکلۆری تینۆتی گریکی‌یـە و کـەمێ گۆڕانی بـەسـەردا هـاتوە • سەرەتای چیرۆکەکە بـە دروێنـەی تەبارەیـەك دەسـت پێدەکاو لـە

---

1 - Κωσταντῆς Κι' ὁ Αράκος, Hahn (J. G. Von) Νεοελληνικὰ Παραμῦθια, p. 196, and : Märchen, II. p. 182.

هەردووكیاندا زۆ لەیەك نزیكە • «دێو» یان «دێف»ی كوردی بەرامبەر (giant) ی ئینگلیزیو (Troll) ی سكەندیفافیو (Rakshasa) ی هیندیو (Drakos)[۲]ی گریكی دەوەستێ كە دەعبایەكی سەرسەختە بەڵام ئاقڵسووكەو هەمیشە مرۆیەكی زیرەك – لە سێ برایان برای گچكە ، یان كوڕی بێوەژنێ – دەیخاپێنێ •

## سێ براو دێوەكە(۳)

هەبوو نەبوو لە شوێنێكا سێ برا هەبوون • برای بچووك ناوی حەسەنۆك بوو ، ئەوەی ناوەنجی ناوی قاسم بوو ، ئەوەی گەورە ناوی شەعبان بوو • یەكەو داسیان هەبوو • حەسەنۆك بە براكانی گوت : « وەرن لەم وولاتە بڕۆین ، بچینە ناو عاشیرەتێكی دی بەشكو ئیشمان دەست بكەوێو كرێیەكی باش وەربگرین » • بەم جۆرە هەرسێكیان سەریان هەڵگرتو ڕۆیشتن تا گەیشتنە بانو بەزراییانو تووشی تەبارە گەنمێك هاتن • حەسەنۆك بە براكانی گوت : « وەرن ، بەری لێبگرین ئەم تەبارە گەنمە بدوورینەوە ، هەڵبەت بە خودانەو خوادانەكەی كرێمان دەداتێ » •

هەر سێكیان چوونە بەر بەرو ملیاندا دروێنە • پاش دوو ڕۆژ دروێنە ، حەسەنۆك ئەشكەفتێكی بینی • ئەشكەفتەكە ئەشكەفتی دێوێك

---

(۲) مستەر جیلدارت بە هەڵە بە عەزیا تەرجەمەی كردووە • بڕوانە:
Vol. I. P. 355, Note.

لەگەڵ ئەمەدا بەراوردی بكە :
Dozen, chants Pop. Bolgares. No. 8.

(3) Lerch, Forschunger über die kurden. P. 49.

بوو • دێوەکە لـە ئەشکەفتەکـە هاتـە دەرەوەو هاوای کرد : « کورە زەلام ئێوە کێن ؟ ئەوە بۆ گەنمی من دەدوورنەوە ؟ ئێستا دێم سـەری هەرسێکتان دەخۆم » •

حەسەنۆك بە براکانی گوت : « مەترسن ، کـە دێوەکـەمان بۆ هات دەڵی : (ئێوە کێن ؟ و ئەوە بۆ گـەنمی من دەدوورنەوە ؟) ئێوە شتاقـان دەنگ مـەکـەن ، بۆ منی لـێ گـەڕێن ، مـن خۆم وەڵامـی دەدەمەوە » • بەم جۆرە کـە دێوەکـە هات ئەوان وازیان لە دروێنە نەهێنا • دێوە نـەڕاندی : « ئەوە لێرە چ دەکـەن ؟ دیارە ناوی منتان نەبیستوە ؟ هەر ئێستا بە یەك قەپ سەری هەر سێکتان قلووف دەکەم »• حەسەنۆك گوتی : « ئەفەندی ــ ماوەم بدە قسەیەکت عەرز بکەم » • دێو وەڵامی دایەوە : « کوڕم ، قسەی خۆت بکە ! » حەسەنۆك گوتی: «ئێمە هەرسێکمان براین ، بێرە داهاتین ، چاومان بەم تەبارە گەنمەیە کەوتو دەستمان بـە دروێنـە کرد چونکـە دەمانزانی خودانی خۆی هەیەو خودانەکەی کرێمان دەداتێ » • دێوە بـە حەسەنۆکی گوت : « زۆر باشــە ، کوڕم ، دروێنەی خۆتان بکـەن ! » ئینجا دێوە لـە حەسـەنۆك چوە پێش‌و گوتی : « کوڕم تۆ داسەکـەت بدە مـن‌و بۆ خۆت نەختێ دانیشە ، پشوویەك بدە » •

بەم جۆرە دێوەو قاسـم‌و شـەعبان هـەرسێکیان تا نوێژی ئێوارە دروێنەیان کرد • ئـەو حەلـە دێوە هـەستا نامەیـەکی نووسی ، دایـە حەسەنۆك‌و گوتی : « ئەم ڕێگایـە بگرە ، بڕۆ ، دەگەیتە چیایـەك ، ماڵی من لەسەر دوندی چیایەکەیـە • ژنەکـەم‌و هەر سێ کچم وان لەوێ • ئەم نامەیە ببە بدە ژنەکەم هەقت نەبێ ئەو خۆی تێ‌دەگا » • حەسەنۆك نامەکەی وەرگرت ملی ڕێی گرت‌و ڕۆیشت • لە ڕێگادا

نامەکەی کردەوە ، دیتی دێوەکە نووسیویە : « کە ئەم کابرایە نامەکەی گەیاندە ماڵێ ، بیگرن ، سەری ببڕن‌و سەرەکەیم بە پلاو بۆ لێ بنێن تا بیخۆم » • حەسەنۆك نامەکەی دڕاند ، نامەیەکی‌تری نووسی : « کە ئەم کابرایە ئەم نامەیەی گەیاندە ماڵێ ، کاوڕی تاڵە سەر ببڕن‌و سەرەکەی بە پلاو لێ‌بنێن‌و لێ‌گەڕێن حەسەنۆك شەو لەگەڵ کچی گەورەم بخەوێ و بۆ بەیانی پلاوەکەی بۆ من پێ بنێرن » •

بەم جۆرە ژنی دێوەکە کاوڕی تاڵەی سەر بڕی‌و گۆشتەکەی بە پلاو لێ‌ناو دایە حەسەنۆك‌و حەسەنۆك پلاوەکەی بۆ دێوەکە برد • دێو وەری گرت‌و بە حەسەنۆکی گوت : « من لە نامەکەدا شتی وام نەنووسی بوو ، ئەم ژنە سەگسارە بۆچی ئەم خواردنەی لێ‌ناوەو پێی ناردووی ؟ بۆچی ئەم خواردنەت بۆ هاوردووم ؟ من لە نامەکەدا شتی وام نەنووسی بوو ، بەڵکو ، نووسی بووم کە ژنەکەم سەری حەسەنۆك ببڕێ‌و پلاوێکم بە گۆشتی حەسەنۆك بۆ لێ بنێ‌و بۆم بنێرێ » • حەسەنۆك گوتی : « ئەگەر دەڵێی ئەم جارە تۆ خۆت بڕۆ ، ئەگەرناش من دەچم ، ئەمجارە با ژنەکەت سەرم ببڕێ‌و بەسەر پلاویەوە بنێ‌و بۆت بنێرێ » • دێوە وەلامی دایەوە : « کوڕم ، داکاسێ ، نامەیەکی‌دی دەنووسم ، ئەمجارەش هەر تۆ بۆ ژنەکەمی بەە ، ئەگەر هاتیەوە ئەو حەلە خۆم دەچم » • حەسەنۆك گوتی : « زۆر باشە ، ئەفەندی » • دێو نامەیەکی نووسی‌و دایە حەسەنۆك ، حەسەنۆك نامەکەی وەرگرت‌و ڕۆیشت • پاش دوو سەعات نامەکەی کردەوەو خوێندیەوە ، دی دێوەکە لە نامەکەدا نووسیویە : « ئافرەتی بەدکار ، ئەگەر ئەمجارە ئەم کابرایە بە ساغ‌و سەلامەتی بگەڕێتەوە یەکسەر دێم سەرو دەست‌و قاچت دەبڕم ؟ چونکە دیارە بە گوێم ناکەی » • حەسەنۆك ئەم مخەنەتی‌یەی دێوەکەی لە نامەکەدا

حوێندەوە ، نامەکەی دڕاندو فڕێیدا ، نامەیەکی تری نووسی :
« ئەم جارە کاوڕی قولە بکوژەوەو بیکە «کەباب ـ ... »، نان‌و پڵاویشی لەگەڵ ڕەوان بکە • لێ گەڕێن حەسەنۆك ئەم شەو لەگەڵ کچی بچووکم بخەوێ‌و بەیانی نان‌و پڵاوەکەی پێ بنێرن » • حەسەنۆك ئەم نامەیەی دایە ژنی دێوەکە ، ئەویش وەری گرت‌و خوێندی‌یەوە :
« ئەم جارە ••• » ژنە کاوڕی قولەی کوشتەوەو گۆشتەکەی کردە کەباب‌و ئەو شەوە حەسەنۆك تا بەیانی لەگەڵ کچی بچووك ڕایبواردە بۆ بەیانی هەستا چوو بە ژنی دێوەکەی گوت : « خواردنەکانم بدێ با بۆ دێویان ببەم » • ژنە هەستا خواردنەکانی دایە حەسەنۆك‌و گوتی :
« لە باتی من سەلامان لە دێوە بکە و پێی بڵێ هەی تاوانبار خواردنت لە ماڵێ نەهێشت » • حەسەنۆك بە ژنی دێوەکەی گوت : « ئەم کاوڕەی گۆشتەکەی دەبەم ـ تۆم دەخاتەوە یاد » • ژنە گوتی :
« بەخێر بگەیتە جێ ، بەختت یاز بێ » • حەسەنۆك وەڵامی دایەوە :
« سوپاست دەکەم ، خوا لێت ڕازی بێ » • حەسەنۆك هەستا خواردنەکانی هێناو دایە دێوەکە • دێوەکە وەری گرت زۆر تووڕە بوو ، گۆشتەکەی فڕێداو بە هەلەداوان گەڕایەوە ماڵێ •

حەسەنۆك بە براکانی گوت : « براینە ، دێوە خواردنی لە ماڵێدا نەماوە ، هەستن با بڕۆین دوور بکەوینەوە » • حەسەنۆك پێش کەوت‌و براکانی کەوتنە دووی‌و ڕۆیشتن ، چوار ڕۆژ ڕۆیشتن •

دێوەکە کاتێ گەڕایەوە دیتی حەسەنۆك لەوێ نەماوە •

حەسەنۆك چوە شارێك‌و براکانی بردە بازاڕو پێی گوتن :
« فەرموو بۆ کوێ دەچن ، بڕۆن » • قاسمی برای حەسەنۆك گوتی :
بۆچی ئێمەت هێنایە ئێرە ؟ » شەعبانی برایشی دایە پڕمەی گریان •

حەســەنۆك گــوتی : « برام ، بۆ دەگری ؟ خــەمت نــەبێ ، خــوا گەورەیە ! » قاســم گوتی : « بۆچی ئێمەت هێنایــە ئێرە ؟ ،چیمــان لێ‌دەکەی ؟ ئێرە غەریباتی‌یەو ئێمــە هیچ دالدەمان نی‌یەو کــەس بــە خۆیمانەوە ناگرێ ••• ئێمە دەچینــەوە ماڵی خۆمان » • حەســەنۆك گوتی : « بۆ خۆتان لای ئاغایەك ئیش بکــەن » • جا براکەی بردە قاوەخانەیەکو بــە خاوەنی قاوەخانەکەی گوت : « ئەفەندی ، ئــەمــە برامە ، ناوی قاسمە ، دەمەوێ ببێ بە شاگردی تۆ » • کابرا وەڵامی دایــەوە : « کوڕم ، برات چ جۆرە ئیشێك دەزانێ ؟ » حەســەنۆك گوتی : « هــەر ئیشێکی پێ‌ی بسپێری دەیزانێ » • ئینجــا خــاوەنی قاوەخانەکە گوتی : « زۆر باشە ، کوڕم » • حەسەنۆك برای لەوێ بــەجێ‌هێشت‌و گــەڕایەوە بازاڕ بــەڵام تا گەڕایــەوە شــەعبــانی برای نەمابوو • یەك مانگ بە دوای‌دا گەڕا ، ئەنجام لە بەندیخانەدا بەسەری گرتەوە • لێ‌ی‌پرسی : « برام ، ئەوە کێ تۆی خستۆتە بەندیخانە ؟ » شەعبان وەڵامی دایەوە : « چوومە لای دێوەکە بۆ ئەوەی پاکانە بۆ خۆم بکەم ، هەر هێندە دێوم دۆزی‌یەوە ، وا دەکەم خراومەتە ناو ئەم بەندیخانەیە » • حەسەنۆك برای لــە بەندیخانە دەرهێنا ، چوار ڕۆژ لەگــەڵی‌دا بوو • بردی‌یە حــەمام ، جوان جوان بــە ســابوون شووشتی‌و کــە هاتــە دەرەوە بردی‌یە لای ســەرۆکی نۆبەتداران • حەسەنۆك بە سەرۆکی نۆبەتدارانی گوت : « ئەمە برامە ، چاوت لێ بێ تا دێمەوە » • سەرۆکی نۆبەتداران گوتی : « پاڵەوان ، ئــەدی خۆت کێوە دەچی ؟ » حەسەنۆك گوتی : « دەچم تۆڵــەی برام لــە دێوەکە دەکەمەوە » • سەرۆکی نۆبەتداران گوتی :« پاڵەوان ، بڕۆ ، بەڵام ئاگادار بە منیش دێوگرم ، لێ‌دەزانم • دێوەکە شیرێکی هــەیە کالانی زێڕەو لــە تــەنیشت چوارپــای نووستنی لــە ژێر پەردەیــەك

ناردوتیەوە • دەست بکە شیرەکەو برۆ ژوورەوە • پەنجەرەیەك لەلای دەستەڕاستە ، برۆ لای ئەو پەنجەرەیەو بیکەوە کە دێوەکە هەتە ژوورەوە شیرەکە هەڵکێشەو کە لێت نزیك بوەوە لەسەری دەو سەری پەل دە با بکەوێتە ئەو گۆڕە • سەرە بڕاوەکە زمانی دێتە گۆ ئەدەر گوتی : « شیرێکی تریشم لێدە ! » پێی بڵێ : « هیچ ئشیری تر ناوەشێنم ، پاڵەوان یەك قسە دەکا » • حەسەنۆك هەستا چوە مالی دێوەکە • شیرەکەی لە بن سەرینەکەی دەرهێنا ، چوە ژوورەوە ، پەنجەرەیەکی لەلای دەستەڕاستەوە بینی ، چوو لەبەر پەنجەرەکە ڕاوەستا • دێوەکە لێی بە ژووریێ کەوت • حەسەنۆك شیرێکی لە دێوەکەداو سەری پەلداو خستیە ئەو گۆڕە • سەری دێوەکە بە حەسەنۆکی گوت : « شیرێکی تریشم لێدە ! » حەسەنۆك گوتی : « پاڵەوان یەك قسە دەکا » • دێوەکە تۆپی • حەسەنۆك کەلەشی دێوەکەی برد فڕێی دا ناو قۆرتێكو بە ڕێگایەکیتردا گەڕایەوە مالی دێوە • کچە بچووکەکەی دێوەی بۆ خۆی بردو ڕۆیشتو چوە دوای سۆراغی قاسمو شەعبانی برای • کە دۆزینیەوە ، کچی گەورەی دێوەی دایە شەعبانی برایو کچی ناوەنجی دایە قاسمی برایو هەر سێکیان داکەوتنو تا مابوون بە ئاشتیو بەختیاری ژیان[٤] •

× × ×

ئەم کورتە چیرۆکە غەمگینەی خوارەوە ، چیرۆکی (خوشكو برا)ی برایانی گریمو چیرۆکی (ئەستێرەگەشەو چۆلەکە)ی فۆلکلۆری

(٤) چیرۆکەکە باس ناکا داخۆ ژنی دێوەکە چی بەسەر هاتوە ، بەلام زۆر لە گوینە ئەو کاتەی دێوەکە بە توورەیی گەڕایەوە مالێ کوشتبێتی •

(ئەپیرۆنی گریکی)مان بیر دەخاتەوە • ئەم چیرۆکە کوردی‌یە ڕەگەزی کانیبالیستی تێدا نی‌یە •

## ئەفسانەی پەپوو(٥)

هەبوو نەبوو ، ژنو مێردێك هەبوون ، کوڕێكو کچێكیان هەبوو • ژنەکە عەمری خوای کردو زۆری پێ‌نەچوو کابرا ژنێکی‌تری هێنا • پاش دوو ساڵ ژنە نوێ‌کە کچێکی بووو لەگەڵ زڕمنداڵەکانی کەوتە ململانەو ڕکابەری •

کچە هەمرو ڕۆژێ دەچوە بەر گاران • ئێوارەیەك کـە هاتەوە ماڵێ برای دیار نەبوو • لە زڕدایکی پرسی داخۆ برای چۆتە کوێ • ژنە وەڵامی دایەوە : « برات چۆتە ماڵی مامت » • کچە چوو نووست لە خەودا بینی برای کوژراوەو تەرمەکەی فڕێ دراوەتە ناو قۆرتێك• بەیانی کە لە خەو ڕابو بـە باوکی گوت : « باوە ، ئـەم شەو لـە خەودا دیم ژنەکەت براکەمی کوشتبوو و فڕێی دابوە ناو قۆرتێك • ئێستا دەچمە بەر گارانو تا ئێوارێ دێمەوە ئەگەر برام هاتبێتەوە باشە ، دیارە چی بەسەر نەهاتوە ، ئەگەر نەهاتبێتەوە دیارە کوژراوە ، ئیدی چیتر ناچمە بەر چێڵانو لێرەش نامێنم » • باوکی وەڵامی دایـەوە : « ئەمرۆش بڕۆ بەر گاران • من خۆم سۆراغی برات دەکەمو هەموو شتێ ساغ دەکەمەوە • لەبەر ئەوەی ژنەکەم ڕکی لـە ئێوە دەبێتەوە تا نەیدۆزمەوە منیش نایەمەوە » • کچە مانگاکانی هاژواو چوە پاوانن • باوکەش چوە دەرەوە ، گەڕا گەڕا ، تا کەلەشی کوڕەکەی دۆزی‌یەوە فڕێ درابوە ناو قۆرتێكو تاشە بەردێکی گەورەی بەسەر دادرابوو •

(5) Lerch, Forschungen & c., P. 80

خێرا گەڕایەوەماڵێو بە ژنەکەی گوت : « ئەوە بۆ کوڕەکەت کوشتووم ، حورمێ ؟ ئەم شەو خوشکی لە خەودا دیبووی برای کوژراوە ، سبەینێ زوو بە گریەن هاتە لامو گوتی : « برام کوژراوەو فڕێ دراوەتەوە ناو قۆرتێك » • منیش گوتم : « ووس بە ، کچم ، قسەی وا مەکە ، مەترسە برات چی لێ نەهاتوە » • کچەکەم گوتی : « ئەمڕۆ دەچمە بەر گاڕانو تا ئێوارێ دێمەوە ئەگەر برام نەهاتبێتەوە چیتر لێرە نابم » • ژنە وەڵامی دایەوە : « دەبڕۆ ، وازم لێ بێنە ، بۆ کەفو کومانم لێدەکەی • دەچی گوێ لە درۆو دەلەسەی کچەکەت دەگریو دێی دەڵێی : « بۆ کوڕت کوشتووم ؟! ، من بۆ کوڕی تۆ دەکوژم ؟ » کابرا بە تووڕەیی ڕۆیشت ، مەیتی کوڕەکەی لە قۆرتەکە دەرهێناو بردییە بەردەمی ژنەکەیو گوتی : « هەی دڕندە ، ئەدی کێ ئەم کوڕەی کوشتوە ؟ » ژنە متەقی لێوە نەهات لە ترسان لەرزی گرتو زمانی بەسترا • باوکە تەرمی کوڕی کوژراوی شووشتو بردییە گۆڕستان ناشتی • کە لە ناشتنی تەرمی کوڕەکەی گەڕایەوە ، سەری ژنەکەی بڕیو فڕێیدا ناو قۆرتێك • ئێوارێ خوشکی کوڕە کوژراوەکە هاتەوە ، نە برای دیار بوو ، نە زڕدایکی • لە باوکی پرسی : « باوکە ، ئەدی کوا باوەژنم ؟ » کابرا وەڵامی دایەوە : « نازانم ، بەڵام ڕاستە ، برات کوژراوە » • کچەکە کە ئەم خەبەرەی بیست کەوتە گریانو ڕۆیشت چوە دەم گۆمێك ، دەستنوێژی شووشتو دوو ڕکات نوێژی کردو پاڕایەوە : « خوایە ، تۆ بێ بمکەیتە پەپوو ! » یەکسەر دیمەنی گۆڕاو بوو بە پەپووی خەمناك ، لە شەقەی باڵیدا ، ڕۆیشتو کەس نەیدیتەوە •

× × ×

ئەم چیرۆکەی خوارەوە یەکسەر چیرۆکی پەروەردەیی باری

«کچی پۆتین لەپێ» مان بیر دەخاتەوە • لەم دەقەیەشدا هەروەکو دەقی سیسیلی کە مستەر لانگ[6] باسی کردوە ، ڕێوی لە ڕووی وەفاداری‌یەوە دەیەوێ ئاشەوان دەوڵەمەند بکات ، بەڵام لەبەر ترسنۆکی‌ی ئەمتەك پاشا هەموو هەوڵو تەقەلای بە فیڕۆ دەڕوا •

## ڕێوی چۆن هەوڵی‌دا کچی پاشای میسر بۆ ئاشەوان بێنێ(۷)

هەبوو نەبوو ئاشەوانێك لە وولاتێکدا هەبوو • باراشێکی زۆر دەهاتە ئاشەکەی ئێوارەیەك هەروەکو جاران ئاشی ڕاگرتو چوەوە ماڵێ و نووست بۆ بەیانی کە هاتەوە ئاش بێنی قوڵغەکە بەتاڵە • شەوی پاشی نەنووست ، نۆبەتی گرت ، دەوروبەری نیرەشەو دیتی ڕێوی‌یەك هات ، چوە ناو ئاش ، ئاردی ناو قولغەکەی هەموو دەرهێنا ، ئاشەوان لێی ڕاپەڕی‌و گرتی‌و دایە بەر داران • ڕێوی ویقاندی‌و بە ئاشەوانی گوت : « بەرەڵلام کە ، شەرت بێ کچی پاشای میسرت بۆ بێنم » •

ئاشەوان وەڵامی دایەوە : « من کابرایەکی ئاشەوانم ، تۆ چۆن کچی پاشای میسرم بۆ دێنی ؟ » ڕێوی گوت : « تۆ مەمکوژە ، شەرت بێ کچی پاشای میسرت بۆ بێنم ، ئەگەر نەمهێنا لەسەرم بدە » • ئاشەوان گوتی : « باشە ، بەڵام سوێندم بۆ بخۆ » • ڕێوی سوێندی بۆ ئاشەوان خواردو ئاشەوان بەرەڵلای کرد • ڕێوی ملی ڕێی گرت ـ برۆ برۆ گەیشتە میسر ، چوە حزوور پاشاو بە ئەدەبەوە سلاوی لێکرد • پاشا بە ڕێوی گوت : « چیت دەوێ بخوازە !؟ »

---

(6) Perrault's tales: Introduction, P. LXXIII.
(7) Lerch, Forschungen, & c., P. 83.

ڕێوی وەڵامی دایەوە : « گەورەم ، ڕێم دەدەی قسەیەك بکەم » •
پاشا گوتی : « فەرموو ! » ڕێوی گوتی : « گەورەم ، تەمتەك پاشا دێتە داخوازی کچەکەت ! » پاشای میسر وەڵامی دایەوە : « سواران بەگەڵ خۆت بدەو بە پیر تەمتەك پاشاوە بچۆ ، ڕەنگە ئەم کابرایە وەزیر بێ چونکە من ناوی وام نەبیستوە ! » ڕێوی گوتی : « گەورەم، دەستە بەرگێکم[٨] بدێ بۆ تەمتەك پاشای بەم و تا دوو ڕۆژی تر سواران مەنێرە پێشوازی چونکە کە هات نزیك بوەوە خۆم خەبەرت دەدەمێ » • پاشای میسر دەستەبەرگێکی دایە ڕێوی‌و ئەویش یەکسەر بردی‌و چوەوە ماڵی ئاشەوان • ڕێوی بە ئاشەوانی گوت : « کچی پاشای میسرم بۆ ڕێك خستووی • ئێستا هەستە بڕۆ حەمام ، خۆت جوان بشۆو ئەم دەستە بەرگە لەبەر کەو وەرە دەتبەمە حوزوور پاشای میسر » •
ئاشەوان چوە حەمام ، خۆی شووشت ، سەروریشی تاشی‌و بەرگە نوێکەی کردە بەرو لەگەڵ ڕێوی ڕویان کردە وولاتی میسرو کە گەیشتنە سەر سنوور ، ئاشەوان بە جێماو ڕێوی چوو خەبەری بۆ پاشا بردو گوتی : « گەورەم ، تەمتەك پاشا هاتوە ، گالیسکەیەکی جوانم بدەرێ سواری بکەم‌و فەرمانیش بدە سەربازەکانت بچنە پێشوازی » •
پاشا فەرمانی‌دا گالیسکەیەکی نایابیان ئامادە کردو چوونە پێشوازی •
بەم جۆرە تەمتەك پاشا چوە میسرو سوپای میسری سلاوی بۆ وەرگرت : سەلامو عەلیکم • بەلام ئاشەوان پەشۆکا بوو وەلامی سەربازەکانی پێ نەدرایەوە • هەندێ سەرباز گوتیان : « کابرا سەرخۆشە ، سەرخۆشە ، پاشا نی‌یە ، ئاشەوانە » • ڕێوی خۆی

---

(٨) دیاری وا لە ڕۆژهەلات زۆر باوەو لە زۆر چیرۆکی فۆلکلۆریدا باسی کراوە •

گەیاندە سەربازەکانو پێی گوتن : « هەوای گەرمە ، تەمنەك پاشا سەخڵەت بوە ، لێی مەگرن » • بەم جۆرە تەمتەك پاشای بردە کۆشکی پاشای میسرو کە لە گالیسکە دابەزی ڕێوی دەستی گرتو بردی‌یە سەرا بۆ حوزوور پاشاو بە پاشای میسری گوت : « ـ ئەفەندی ـ ، مانگێ دەبێ تەمتەك پاشا هۆشی لەقاوە » • پاشای میسر وەڵامی دایەوە : « باشە ، بیبە ژووری خۆی ، با لەسەر چوارپاکە بحەسێتەوە » • ڕێوی قسەکەی بەجێ‌هێنا بەڵام ئاشەوان لە ترسان چرکو هۆڕ دەلەرزی • ڕێوی پێی‌گوت : « تووکت لێ‌وارێ، بەس بلەرزە ، پاڵ دەوەو پشوویەك بدە ! » ئاشەوانی زارەترەك گوتی : « ئێستا پاشای میسر دێ لەسەرم دەدا » • ڕێوی گوتی : « نەء ، نایە •••مەترسە • من بەجێت ناهێلم بەڵام هۆشت لە خۆت بێ ، ئەگەر هاتە ژوورەوە لەبەری هەستەو داوێنی کەوای ماچ کە ! » ئاشەوان گوتی : « ئاخر پاشا بێتە ژوورەوە دەمکوژێ » • ڕێوی گوتی : « هەستە ، ئاوت بۆ بێنم ، دەستنوێژت بشۆو نوێژێك بکە » • ئاشەوان وەڵامی دایەوە : « باشە ، ئاوم بۆ بێنە با دەستنوێژ بشۆم » •

ڕێوی چوو ئاوی هێناو هاتەوە دایەوە ئاشەوان ، ئاشەوان چوە دەرەوە بۆ ئەوەی شوێنێك بدۆزێتەوە دەست بە ئاو بگەیەنێ بەڵام شارەزا نەبوو • ڕێوی ماوەیەك چاوەڕێی کرد ئاشەوان هەر نەهانەوە• بە دوای‌دا چوو ، دیتی لەو ساکە گۆڕە کەوتوەو قنیاتی لەبەر بڕاوە • خێرا چوە کن پاشای میسرو پێی‌گوت : « تەمتەك پاشا چوە دەرەوە دەستنوێژ بشوا ، لە دەرەوە کەوتو مرد » • پاشا گوتی : « بڕۆ بیهێنە ژوورەوە » ڕێوی مەیتی ئاشەوانی بردە ژوورەوە ، پاشا فەرمانی‌دا شووشتیانو بردیان ناشتیان •

× × ×

ئەم چیرۆکەی خوارەوە ، سەرەتاکەی دەق وەکو چیرۆکی «ڕێوی‌و لەقلەق» وایە • مەسەلەی فەروەی مەلا مۆرکێکی تەواو ڕۆژهەلاتی‌یە • کۆتایی‌یە ترازیدی‌یەکەیشم بەلاوە نوێ نی‌یە ، لە چیرۆکێکی‌تری ڕۆژهەلاتی‌دا بیستوومە بەلام بە داخەوە بەبیرم نەماوە هی چە نەتەوەیەکە •••

## ڕێوی‌و هەلۆو گورگ(٩)

هەبوو نەبوو ، ڕێوی‌یەك‌و هەلۆیەك هەبوون ، بە برایانە دەژیان• ڕۆژێ ڕێوی بە هەلۆی گوت : « وەرە زیافەتم بۆ کردووی ! » هەلۆ چوە مالی ڕێوی ، دیتی خەریکە خواردن ئامادە دەکا ، کە خواردنەکە ئامادە بوو ، ڕێوی گۆشتەکەی لە ناو قاپێکی پەل کردو داوای لە هەلۆ کرد بۆی دابەزێ‌و گوتی : « برام ، فەرموو بخۆ ! » بەلام هەلۆ ئەوەندەی دەنووکی لە قاپەکەدا هیچی هەلنەکراند کەچی خانەخوێ بە کاوەخۆ دەیخواردو دەیماشتەوە •

ئینجا هەلۆ بە ڕێوی گوت : « فەرموو ، سواری پشتم بە بچینە مالی ئێمە » • ڕێوی سواری پشتی هەلۆ بوو • هەلۆ بەرزبووەوە ئاسمان ، مەلایەکی‌دی لەسەر فەروەکەی نوێژی دەکردو چوو بوە دەرنوێش • ڕێوی بەسەردا بەردایەوە • مەلا زەندەقی چوو ، پڕ بە پێ هەلات‌و فەروەی بە جێ هێشت • ڕێوی خێرا فەروەکەی لەبەر کردو ڕۆیشت • لە ڕێگادا تووشی گورگ هات • گورگ لێی‌پرسی: « ڕێوی برا ، ئەم فەروە جوانەت لە کوێ بوو ؟ » ڕێوی وەلامی دایەوە : « گورگی برا ، من خۆم کردوومە ! » گورگ داوای لێ کرد:

---

(9) Lerch, Forschungen & v., P. 46.

« کەواتە ڕێوی برا ، فەروەیەکی وایش بۆ من ناکەی ؟! » ڕێوی گوتی : « با ، فەروەیەکی وات بۆ دەکەم » •

ـ کەی تەواو دەبێ ؟

ڕێوی وەڵامی دایەوە : « حەفت بەرخم بۆ بێنە ، تا بۆت دەست پێبکەم » • ڕێوی چوە ناو کونو لێیڕاکشا • گورگ ڕۆیشت ، حەفت بەرخی بۆ ڕێوی هێناو هاتەوە • ڕێوی گوتی : « گورگی برا ، بڕۆوە ماڵێ ، دوای سێ ڕۆژیتر وەرەوە ، فەروەکەت تەواو دەبێ » •

گورگ پاش سێ ڕۆژ هاتەوەو داوای فەروەی کرد • ڕێوی وەڵامی دایەوە : « ڕاستە ، باوکم فەروەی باشی دەدووری بەڵام من هیچی لێنازانم » • گورگ گوتی : « ڕێوی برا ، دە لە کونەکەت وەرە دەرەوە ! » ڕێوی وەڵامی دایەوە : « بڕۆ ڕێی خۆت ، ئەم حەفت بەرخە بەشی یەك ساڵی ڕەبەقم دەکات ، چۆن دێمە دەرەوە ! » گورگ گوتی : « منیش یەك ساڵ لەبەر دەرکی کونەکەت چاوەڕێ دەکەم » • بەڵام ڕێوی هیچ گوێی نەدایە ، هەر حەفت بەرخی خواردو چوو نووست • گورگ حەفت هەشت ڕۆژ لەبەر دەرکی کونەکە چاوەڕێی کرد ،کە بینی ڕێوی نایەتە دەرەوە چوو کودوویەکی وشکی هێناو هەندێ بەردی تێکردو لەوێ بە جێی هێشت • کە کودووەکە گلۆر دەبوەوە دەنگی لێوە دەهاتو ڕێوی دڵی دادەخورپا • ڕێوی تەنگاو بوو • لە کونەکەی دەرپەڕیو چاوی لە گورگ گێڕا ، گورگ دیار نەبوو ، پێی لە جەرگی خۆی ناو هەڵی کوتایە سەر کودووەکە ، کە چوە سەری و زانی کودووە لە کلکی خۆی بەستو چوە سەر کانییەكو کلکی شۆڕکردەوە ناو ئاو • کودوەکە پڕ ئاو

بوو ، کە ڕێوی کلکی خۆی ڕاکێشایەوە کلکی لە دوو نەهات و بانگەڕۆز بوەوە ناو ئاوەکە •

× × ×

مستەر ژابا کە باسی ئەم چیرۆکەی خوارەوە دەکا ، دەڵێ دەبێ (ساری سالتێ) پیرەمێردێ بێ لە خاخپەرستەکان و جێگای خەزێنەکەی پێزانیبێ و لە ئەوروپاوە بە بەرگی دەروێشی بە دوایدا هاتبێ • من لە خۆم ڕادەبینم بڵێم بۆی هەیە ئەمەیان (ساری سالتێك)ی پیری جەنگاوەری بەناوبانگ بێ کە پیرێکی موسلمانە و بەشداری غەزای عوسمانلی کردوە و کوردەکان زۆر ئەفسانەی لە ئاسا بەدەری لێ دەگێڕنەوە(١٠) •

## ئەرمەنیی و دەروێش(١١)

هەبوو نەبوو ئەرمەنییەك هەبوو ناوی (ساتر) بوو ، لە شاری (بەگریف) دەژیا کە دەکەوێتە بەر قەزایەکی (وان) • ڕۆژێ دەروێشێك ڕێی کەوتە ئەم شارەو بوو بە میوانی ئەم ئەرمەنییە • بەکاری خوا ئەم دەروێشە کە ناوی (ساری سالتێ) بوو نەخۆش کەوت و ماوەیەکی زۆر لەو ماڵە لەناو جێ کەوت • ئەرمەنییەکە بە خۆو بە خێزان و هەموو منداڵەکانی خزمەتێکی زۆریان کردو ئەوەی پێیان کرا بۆساری سالتێ کردیان •

---

(١٠) هەندێ لەم ئەفسانانە لە چیرۆکیی ئەولیا ئەفەندیدا هەن کە پیرێکە یەك لە کردەوەکانی ئەوەیە دەعبایەکی حەفت سەر دەکوژێ و کچی پاشا لە دەمی دەعباکە دەرباز دەکا • دەڵێن شارەو شار گەڕاوەو بە کەوڵەمەڕەکەیەوە لەسەر دەریا ڕویشتوە •

(11) Recueil de Notices et Rècits Kourdes, P. 94.

پاش دەوری دوو مانگ دەروێش چاك بوەوەو شەنگی هاتــەوە بەر • ڕۆژێ بە ساتری گوت : « بۆ ئەم شەو ، فەردەیەكو پەتێكو ئەستێو بەردەستێیەكو مۆمێكو شقارتەیــەك ئامادە كــە • هــەمووی ئامادەكە چونكە ئەمشــەو دەچینــە شوێنێكی وا كــە ئــەو شتانەمان پێ دەوێ • تۆ زۆر خزمەتی منت كردوەو ئازارت پێوە كێشاوم ، دەمەوێ چاكەو پیاوەتیت بدەمەوە » •

ساتری ئەرمەنی ، ساری سالتێ چی گوتبوو ، هەمووی ئامادەكردو لەناو فەردەكەی كردو هەر هێندە شەو داهات ، بە خۆیو بە دروێش شتەكانیان هەڵگرتو لە شار چوونە دەرەوە • كەلاوە كۆشكێكی كۆنی سەردەمی دیانەكان لەسەر گردێكی نزیك گوندی كوزوت هەیە كــە سەعاتە ڕێیەك لە شاری بــەگریف دوورە • دەروێش ساری سالتێو ساتری ئەرمەنی چوونە ناو كەلاوە كۆنی ئەم كۆشكە • دەروێش بە ساتری گوت : « دەزانی بۆچی تۆم هێناوەتە ئێرە ؟ » ئەرمەنی وەڵامی دایەوە : « نەخێر ، نازانم ، خۆت دەزانی » • ئینجا دەروێش بۆی باس كرد كە خەزێنەیەك لەناو ئــەم قەڵایەدا هەیــە كــە پاشماوەی سەردەمی دیانەكانە ، ئینجا گوتی من سیحری سەر خەزێنەكە دەشكێنمو پێكەوە دەچینە ژوورەوەو چەندت زێڕ دەوێ بۆ خۆتی ببە ، بەڵام هیچ قسەت لەدەم دەرنەیە ! » •

پاش ئەوەی دەروێش بەم جۆرە ساتری ووریا كردەوە ، هەندێ دوعای خوێند ، لەناو كەلاوەكە بوو بە دەنگە دەنگو بوومەلەرزە، پاش نەختێ دەرگایەك كرایەوە ، دەرگای خــەزێنەكــە بوو • هەردووكیان چوونە ژوورەوە • ساتر مۆمێكی پێ‌كرد ، دیتی ژوورەكــە ژوورێكی زۆر گەورەیــەو زێرو دراوی ســەردەمی ئیمپراتۆریەتی دیانانــی بــە

جۆخین تێدا هەڵدراوەتەوە • کـەوێکی زێڕی چاو ئـەڵماس لەسـەر جۆجینەکـە دەبریقایـەوە ، دندووکو باڵـەکانو سـەراپای لـەشـیشی جەوهـەرداش بووو لەبـەر ڕوناکی دەبریسکایەوە • دەروێش دەستی درێژ کرد ، ئـەم تەیرە زێڕەی گرتو لەژێر چاکەتی ناو بـە ساتری گوت بە کەیفی خۆی ئـەوەندەی پێی هەڵدەگیرێ زێڕ لـە فەردەکـە بکا • ئەرمەنی بارە زێڕێکی هێندە گرانی لـە خۆی بار کرد کە بـە ئاستەم لە بنی دەجوولایەوە • لە ژوورەکە هاتنـە دەرەوە ، دەروێش هـەندێ دوعای خوێندو دەرگای خەزێنەکـە داخرایەوە • ڕۆیشتن ، پاش ماوەیەك دەروێش بە ساتری گوت : « ئێستا لێك دادەبڕێین ، تۆ بڕۆوە ماڵی خۆتو منیش دەچمـە دوو ئیشی خۆم ، بـەڵام لـە بیرم مەکە » • ئیدی خاتری خواستو ملی ڕێگای خۆی گرتو ڕۆیشت • هەر هێندە ئـەو ڕۆیشت شـەیتان دڵی سـاتری خستە قرتو فرت • پێی ناخۆش بوو کە دەروێش پەیکەرە جەوهەرداشەکەی برد • لە دڵی خۆیدا لێکیدایەوە کـە ئـەویش هاوبـەشی دەروێشەو بەشی لە باڵندەکەشدا هەیـە • فـەردە زێڕەکـەی داناو بـە غار کەوتە دوای دەروێش بەو نیازەی کـە بـە خۆشی بێ یان بـە ناخۆشی باڵندەکـەی لێبسەنێ • کە لە ساری سالتێ نزیك بوەوە ، سالتێ گوێی لە ترپەی پێی بوو ، ئاوڕی دایـەوە ، دیتی سـاترە ، لێیپرسی : « هـا چیت دەوێ ؟ بۆ هاتووی ؟ »

ئەرمـەنـی وەڵامـی دایـەوە ، گوتـی : « باڵنـدەکـەم دەوێ ، زێڕەکەم ناوێ » •

دەروێش گوتی : « کورە ، خۆ تۆ شێت نەبووی ، تۆ ئەوەندە زێڕەت سەرو زیادە ، واز بێنـە بڕۆ دوو ئیشی خۆت کـەوت نادەمێ

من له فەڕەنگستانەوە[١٢] بۆ ئـەم کەوە هاتووم ، بەڵام لـە ڕێگادا لام دا ماڵی تۆ و ئەوە بوو نەخۆش کەوتمو خزمەتێکی باشت کردمو منیش له پاداشتی ئەو خزمەتە ئەم هەموو زێڕەم پێ کەرەم کردیت » •

ساتر گەڕایەوە بەڵام شەیتـان لێی نەگەڕا ، دیسان تیخ‌تیخەی‌دا کە بچێ بە کوتەکی کەوەکە لە دەروێش بسەنێو زێڕەکەیشی زیاد•• ئیدی کەوتەوە شوێن ساری سالتێو بە کورتی ئەوەندەی سالتێ بە بەری داکەوت وازی لێ‌بێنێ کەلکی نەبوو ، ئیدی کە زانی ساتر دەیەوێ بە خورتی کەوەکەی لێ‌بسەنێ گوتی باشە لێم وەرە پێش با کەوەکەت بدەمێ ، هـەر هێندە ساتر لێی‌نزیك کـەوتەوە سـاری سالتێ شێنێکی بەهێزی بـە کەپووی داداو سـاتر لـە هۆش خۆی چوو بـە پشت‌دا کـەوت •

دەروێش ڕۆیشتو ساتر تا ڕۆژی پاشی وەخۆی نەهاتەوە ، کە وەخۆی هاتـەوە هـەستایـەوە دیتـی دەروێش ڕۆیشتوە ، گـەڕایەوە فەردەکەی هەڵگرتو بەرەو ماڵ بوەوەو چۆوە زێڕەکـەی لـە ماڵـەوە تەقەت کرد • ووردە ووردە کەوتە کڕینی شتی باش‌و بەنرخ • زۆر گاجووت‌و مێگـەلـە مـەڕو هـەندێ ئاشی کڕی ، کاتێ کـە حاکمی (بەگرێف) بەمەی زانی گومانی پەیدا کرد گوتی مادام ساتر ئەم هەموو شتانـەی کڕیوە دیارە گەنجینـەی دۆزیوەتـەوە • دەرو دراوسێ بۆ حاکمیان گێڕایەوە کـە ماوەیـەك پێش ئێستا دەروێشێك هاتۆتە ئـەم شارەو بۆتە میوانی ساترو لەوێ نەخۆش کەوتوەو پاش چاك بوونەوەی ڕۆیشتوەو لـەو کاتەوە ساتر دەوڵەمەند بوە • پاشان هەندێ دراوی

---

(١٢) فەڕەنگستان : ووڵاتی فەڕەنگ واتە ئەوروپا •

کۆنیان لە ماڵی ساتر دۆزی‌یەوەو بەمەوە لێی ئاشکرا بووو دونیا پڕ بوو کە ساتری «بەگریف» گەنجینەی دۆزیوەتەوە • ئەم خەبەرە بە پاشای (وان) گەیشتەوەو ئەویش لە دوو ساتری ناردو خستی‌یە بەندیخانە ، ساتر پێی لە مەسەلەکە ناو بەشی پاشای (وان)ی لە زێڕەکە داو ئازاد کرا • بە کورتی ساتر وای لێهات پێ‌پانێی بە زێڕ دەکردو بە هەموو لایەکدا بڵاوی دەکردەوە •

بۆی هەیە زۆر کەس گومان لە ڕاستی ئەم چیرۆکە بکەن بەڵام لەگەڵ ئەمەش‌دا خەڵکی ئەو ناوچانە ڕوایەکی پتەویان پێ هەیەو زۆر باسی دەکەن‌و زێدە لەمەش نەوەکانی ساتر هێشتا لە بەگریف ماوزو بە خۆشی‌و دەوڵەمەندی دەژین‌و خاوەنی زەوی‌و ئاش‌و چەند جووتەگاو مێگەلە مەڕن‌و ماڵی خانەدان‌و ناندەرن • ماڵیان وەکو «تەکیە»[١٣] وایە چونکە ئەوەی بێ دەبێتە میوانی ئەم بنەماڵەئەرمەنی‌یە، هەتا دەست بە ڕووی موسلمانانیشەوە نانێن بەڵکو زۆر بە گەرم‌وگوڕی بەخێریان دێنن • لەو ڕۆژەوە ساتر ناوی لە ناو کوردان دەرکردو کورد بوونە برادەری‌و مەڕو ماڵاتیان بە دیاری بۆ دەهێنا ، بەڵام وایش دەبێ کە دوژمنداریان لەگەڵ خەڵکی بەگریف ببێ ، بێجگە لەمەش ، هەرچەندە دزی‌و تاڵان لەم شارە بکرێ ، کەس دەست بۆ ماڵی ساتر نابا ؛ چونکە دەڵێن ماڵیان وەکو تەکیە وا پیرۆزەو نابێ بە خراپیش تەماشا بکرێ •

× × ×

مستەر (ڕیچ)[١٤]ی ڕەحمەتی ئەم چیرۆکەی پاراستوە کە بە

---

(١٣) تەکیە : جێی دەروێشانەو میوانداری باش تێدا دەکرێ •
(14) Narrative & c., vol. I. P. 291.

دەقە خۆی لە دەمی حەکایەتخوانێکی هۆزی بەبەی دارەشمانە وەری گرتوە ، وەکو خۆی گۆتەنی ، بێ ئەوەی هیچی بۆ زیاد بکا یان بە هیچ جۆرێ بیگۆڕێ • ڕووداوەکانی چیرۆکەکە تەواو لەوانە جودان کە لە چیرۆکی کوردیدا هەن و بۆی هەیە لە ڕووداوێکی ڕاستەقینەوە هاتبێ بەڵام هی سەردەمێکی زۆر کونتر بوە لەوەی حەکایەتخوان باسی دەکا کە زۆر کەس لە ڕۆژهەڵات بە ڕووکەشی باسیان کردوە • حەکایەتخوان هەموو چیرۆکێکی باش بۆ بەرەبابی گەورەی پاڵەوانی ناوداری کورد ، سلێمان بەبە ، دەباتەوە ، ئەمە ئەگەر پێی نەکرێ بیباتەوە سەر پاڵەوانەکە خۆی ، بێ ئەوەی کە گوێ بداتە سەرچیخچوونی مێژوویی • لەوانەیە ئەم چیرۆکە پاشماوەی هەندێ چیرۆکی سوارچاکیی سەردەمی خاچپەرستانی زەمانی سەلاحەدین بێ کە کورد بە میری خۆیانی دادەنێن •

ئەفسانەیەکی وایش لە چیرۆکیی میللی گریکیدا هەیە بە ناوی « ئەو کچە پاشایەی چوە شەڕ »(١٥) •

## کچێکی پاڵەوان*

هەبوو نەبوو دوو برا لە دارەشمانە هەبوون ـ فەقێ ئەحمەدو خدر کە زۆر دەردو ئازاریان بە دەست بلباسی دوژمنیان چەشتبوو ـ

---

(١٥) هەمان سەرچاوەی پەراوێزی (١) بەشی چوارەم ، ل ٥٧ •
هەروەها : Märchen, I. P. 114.

* بۆ پتر ئاگادار بوونی مێژووی بنەماڵەی بابانو داستانی فەقێ ئەحمەدی دارەشمانەو کەیغانی فەرەنگ ، بڕوانە :
ڕەمزی قەزاز : داستانی دوو پاڵەوان ، فەقێ ئەحمەدی دارەشمانەوکەیغانی فەرەنگ ، بەغدا ، ١٩٦٨ •

بڵباس هۆزێکی هەرە بەهێزی ناوچەی پشدرە ـ • فەقێ ئەحمەد پیاوێکی ڕەشیدو ئازار بوو ، ناچار بوو گوندی بە جێ هێشت،و سوێندی خوارد تا وای لێ نەیێ بتوانێ تۆڵەی خۆی بکاتەوە نەیەتەوە ئەو گوندە • چوە قوستەنتینیە بوو بە نۆکەری سولتان •

بە ڕێکەوت ، ئەو کاتە سولتان لەگەڵ ئینگلیس یان فەڕەنگ شەڕی بوو • ئەو سەردەمە ، شەڕ بە یەك هەڵمەتو لێکدان دەبڕایەوە •

پاڵەوانێك لەناو لەشکری فەڕەنگان هەڵکەوتبوو ، پێنج ڕۆژ بوو مەیدانی لە سوارەی تورکان گرتبوو ، هەر کەسێ بۆی دەچوە مەیدان دەیبەزاندو سەری دەبڕی • فەقێ ئەحمەد کە بەمەی زانی بڕیاریدا بچێتە مەیدانی ئەم دوژمنە ترسناکە • سولتان لە دووی ناردو لێیپرسی داخۆ لە چ نەتەوەیەکەو هی کام وولاتەو کە دیتی پیاوێکی بە جەوهەرو لێوەشاوەیە ئەسپێکو چەکێکی باشی پێشکێش کردو ڕێی دا بچێتە مەیدان •

فەقێ ئەحمەد چوە مەیدانو سوارەی فەڕەنگی لە عەردی داو کە دابەزی سەری ببڕێ ، لە سەرسامیان هۆپێکی لەخۆی زانی کە دیتی ئەم دوژمنە بەوەجە کچەو کچەکە لەبەری ناورایەوە نەیکوژێو بەڵێنیدا مێردی پێبکا • فەقێ ئەحمەد بە سەرفرازی کچەی هێنایەوە ناو ئۆردووی تورکان • سولتان گوتی : بخوازە هەر پاداشتێکت دەوێ بتدەمێ • فەقێ ئەحمەد داوای گوندو زەویو زاری دارەشمەی کردو سولتان « فەرمان ـ Firman »ێکی شاهانەی دەکردو کردی بە بەگی دارەشمانە • لێرەدا چ لە ڕووی خاکییەوە بێو چ لە ڕووی نەزانی، فەقێ ئەحمەد هەلێکی گەورەی لە دەست خۆی دا ؟ چونکە ئەگەر

داوای سەراپای کوردستانی بکردایە سولتان پێیدەبەخشی • فەقێ بەو خەڵاتەی سولتان ڕازی بووو لەگەڵ کەیغانی ژنی سەرکەوتوانە بەرەو زێدی خۆی گەڕایەوە بەڵام تا ئەو وەختە دوو منداڵی ببوو : بەبە سلێمانو بوداخ کەیغان • شەڕێکی سەختی لەگەڵ بلباسان کردو بلباس چیتر نەیاتوانی دەستدرێژی بکەنە سەر •

ڕۆژێکیان ، فەقێ لە ماڵەوە نەبوو ، بلباس لەشکریان کردو دڕندانە پەلاماری دێیان دا • کەیغانی ژنی فەقێ ئەحمەد خۆی تەیار کردو بە تاقی تەنێ لێیان ڕاپەڕی ، چوار سەد پێنج سەد سوار دەبوون ، هەمووی هەڵبڕین و زۆری لێکوشتن ، ئینجا گەڕایەوە ئاوندو خەڵکی دارەشمانەی کۆکردەوەو هەر لە سواری ئەسپەکەیەوە پێی گوتن :

« ئەی خەڵکی دارەشمە ، کاتی خۆی کە فەقێ ئەحمەد هاتە مەیدانی من ، منی لە زەویداو دەبوایە بمکوژێ ، بەڵام جەبی دامو سەری نەبڕیم • منیش وا ئەمڕۆ پاداشتی ئەو چاکەیەم دایەوە • لە مێژ بوو چاوەڕێی هەلێکی وا بووم • کە فەقێ ئەحمەد هاتەوە ، چیتان بە چاوی خۆتان دیوە بۆی بگێڕنەوەو بە زمانی من پێیبڵێن من وا ڕۆیشتمو تازە جارێکیتر نامبینێتەوە ، پێیشی بڵێن نەکا بێتە دووم چونکە هاتنی بەلاشەو ئەگەرچی حەزیش ناکەم بەڵام زۆرم لێبکا ناچارم ئەزیەتی دەدەم » •

وای گوتو جلەوی ئەسپی بادایەوەو تێیتەقاندو ڕۆیشت • کە فەقێ ئەحمەد هاتەوەو بە مەسەلەکەی زانی زۆر سەرسام بووو گەلێك سوویشی لە کەیغانی ژنی بوەوە ، هەرچەندە کەیغان گوتبووی بە دوای دا نەچێ بەڵام فەقێ ئەحمەد خۆی پێنەگیراو هەر چوو •

له دۆڵی خدران ، کە کەوتۆتە ناوچەی پشدەر ، تووشی هاتو تکای لێکرد بگەڕێتەوە • ژنە وەڵامی دایەوە : « قەت شتی وا نابێ ، تۆ موسلمانیو من فەڕەنگم • دەچمەوە ووڵاتی خۆمو باوکو باپیرم ، بە خاتری تە • نەکەی لێم نزیك بیتەوە نەوەك ئەزیەتت دەدەم » •

فەقێی شەیدا هەر مکووڕ بوو ، وازی نەهێنا ، ئیدی ژنە ناچار بوو ڕمێکی حەواڵە کردو شانی پێکا • فەقێ کەوتو ژنەیش ڕێی لێداو ڕۆیشت ؛ بەڵام زۆری پێنەچوو لە دڵی خۆیدا کەوتە بیرو لێکدانەوە ، هەستی کرد کە ئەو یاداشتەی بەفەقێ ئەحمەدی داوەتەوە شتێکی زۆر کەمە بەرامبەر بە چاکەی فەقێ کە کاتی خۆی لە مردن ڕزگاری کردوە ، هەستی کرد کە هەر چەندە فەقێ موسلمانیشە بەڵام باوکی منداڵەکانییەتی ، لەم بیرانەدا بوو ، دڵی خاو بودوەو گەڕایەوە سەر فەقێ ئەحمەد ، دیتی هێشتا هەناسەی لەبەردا ماوە • برینەکەی پاك کردەوەو مەڵحەمی لێداو کە زانی ئیدی مەترسی مردنی نەما بەجێی هێشتو ڕۆیشت • بەڵام فەقێی باوکو ئاشقو جگەرسووتاو شەرمی بە زەبری کەیفان نەبوو ، هەر هێندە برینەکەی چاك بووەوە ، بڕیاری دا بەدوایدا بچێو بە هەر جۆرێ بێ بیهێنێتەوە • بە دوایدا چوە فەڕەنگستان • شەو گەیشتە شارێکی گەورە ، هەراو بەزمو شایلۆغان بوو ، لە «مەهتەرخانە ـ Mehter Khana یاریو بەزم بوو ، «مەشعەل ـ Mashall » پێکرا بوو و هەموو پێویستییەکی ئاهەنگو زەماوەند ئامادە بوو • فەقێ نەیزانی چ بکاتو سەر بە کوێدا بکات • بڕیاری دا خۆی بحاتە دەست قەزاوقەدەرو ئەسپەکەی لە کوێ ڕاوەستا لابداتە ئەوێ • جلەوی ئەسپەکەی بەرداو ئەسپ چوو لەبەردەم ماڵی پیرەژنێك ڕاوەستا •

پیرەژن هەندێ ڕوبیانووی هێنایەوەو تەگەرەی خستە پێش بەڵام هەر چۆنێ بوو فەقێ ئەحمەد پیرەژنی ڕازی کرد کە ئەو شەوە داڵدەی بدات • پاشان ، فەقێ ئەحمەد لە پیرەژنی پرسی ئەم هەموو بەزم و هەراو هۆریایە چی‌یە • پیرەژن وەڵامی دایەوە گوتی ئەوە بۆ کچی پاشایە • کچی پاشا چوبوە شەڕی موسلمانان و چەند ساڵ بوو بزر ببوو ، تازە هاتۆتەوەو خەریکە مێرد بە پسمامی دەکات • فەقێ ئەحمەد تکای لە خانەخوێ کرد بەڵکو وا بکا ئەمیش بچێتە سەیری ئەم بەزم و زەماوەندە • خانەخوێ ڕازی بوو بەو مەرجەی فەقێ بەرگی ئافرەتان بکاتە بەر • فەقێ بەرگی ئافرەتانی کردە بەرو چوە پێشەوە دانیشت بۆ ئەوەی گوێی لە قسەی بەینی کەیخانی نازدارو مێردە تازەکەی بێ •

کە خانم هات ، مێردی دڵڕەقی مستەکوڵەیەکی لە بناگوێدا و گوتی : « تۆ یەخسیری دەست موسلمانان بووی • موسلمان شەرەفیان بردووی ، تازە کوو چاوو ڕووت هەڵدێنێ بێیتە بەرامبەری من » • بووك کە زمانی کوردی فێر ببوو ، لە داخی دڵی خۆی ، بە کوردی گوتی : « ئاخ ، فەقێ ئەحمەد ئێستا لێرە بوای !؟ »

فەقێ ئەحمەد یەکسەر دەرپەڕی‌و خۆی لێ ئاشکرا کرد • هەڵمەتی برد ، زاوای کوشت‌و ژنەی فڕاندو هێنایەوە قوستەنتینەو لەوێ سولتان لە چاکەی پێشوو خەڵات‌و بەراتێکی زۆری کرد • ئینجا ژن‌و مێرد گەڕانەوە پشدەرو تا مابوون بە شادی ژیان •

فەقێ ئەحمەد پێش مردنی ، ناوچەی پشدەرو مەرگەوەڕو ماوەتی هەموو خستە بەر دەستی خۆی‌و بە هۆی بەبە سلێمانی کوڕە گەورەی کە بابە گەورەی میری ئێستای سلێمانی‌یە توانی ناوچەکانی‌تری

کوردستان ، کـه ئێستا لـه ژێر دەستیان دایـه ، بخاتـه ژێر ڕکێفی خۆیەوە ••

× × ×

ئەو سولتان مورادەی لەم چیرۆکە کوردی‌یەی خوارەوەدایە زۆر لەگوینە سولتان موراد چوارەم بێ کـه لە سـەدەی حەڤدەم حوکمی گێڕاوەو وەکو هارونـه ڕەشیدی ناودار ، هـەموو جـارێ جلی خۆی گۆڕیوەو بە ناو پێتـەختدا سووڕاوەتەوە • چیرۆکی سـولتان مورادو شوانـەکـه وەکو چیرۆکی جێمس • ڤی • سـکۆتلاندە ـ کودمـانی بالینگویش ـ لەگـەڵ «دۆنالدس»ی وەرزێر وایە کە پاشان بە (پاشای زەلکاوەکان) ناوی دەرکرد[16] •

## سولتان مورادو سیسۆی شوان[17]

شتێکی باوە کە کورد بە مێگـەل مـەڕ دەبەنـە سوریاو سعودیاو قوستەنتینە • جارێکیان شـوانێك هـەبوو ناوی سیسۆ بوو لە عاشیرەتی بەرابـەروکان بوو • مەڕی بۆ فرۆتن بردە قوستەنتینیە • بـە عادەتی شوانان کەوڵـە بزنی بـە شانی دادا بووو لـە نزیك پێتەخت مـەڕی دەلەوەڕاند •

ڕۆژێکیان ، سولتان موراد بە خۆیو بە «لالە Lala »یەوە[18]، بەرگی دەروێشانیان کردە بەرو چوونە پەڕگەی شار ، ئەو شـوێنەی

---

(16) Sir. W. Scott‘s Poems, Appendix to “The Lady of Lake, p. 260” (Blakes èditions, 1865).

(17) Jaba, Recueil & c. , P. 62.

(١٨) پەروەردکار یان نۆکەری بڕواپێکراو • ئـەم ووشەیە بۆ ئـەو بەندەیەش بەکار دێ کە منداڵ بەخێو دەکا •

سیسۆ مەڕی لێدەلەوەڕاند • سـولتان موراد لـە عومری خۆی کوردی نەدی بوو ، هیچ شوانیشی بەو جۆرە بەرگەوە نەدی بوو • سیسۆی بەو بەرگە عەنتیکەوە دی سەری سوڕماو بـە لالـەی گوت : « ئەم کابرایە لە چ نـەتەوەیەکـە ، هیچی بـە خـەڵکی ئەستەمبوڵ ناچێ ، کەوڵە بزنی بەسەر خۆیدا هـەڵکێشاوە » • لالە وەڵامی دایەوە کـە ئەمە کوردی ئەنەدۆڵەو مـەڕی بۆ فرۆتن هێناوە • سـولتان گوتی : « دەبا بچینە لای ئەم عاجباتی‌یە ، بزانین چ جۆرە پیاوێکە » • پاشاو لالە ، بە بەرگی دەروێشی چوونە لای شوانەکەو سڵاویان لێکرد • ئەویش بە گەرمی جوابی سڵاوی دانەوەو گوتی : « بابە "baba" دەرۆیشینە بەخێر بێن » • سولتانو لالە دانیشتن • شوانەکە قەنەیەکی کلك قوتـی پـێبوو ، دایگـرتو پێشکێشی دەروێشـەکـانی کـرد • دەروێشەکان لـەم ڕووخۆشی‌یەی شوانـەکـە زۆر سـەرسام بوون • شوانەکـە پێی‌گوتن : « نانو شیرم هەیـە ، دەچـم هـەندێکتان بۆ دێنـــم » •

سولتان موراد ویستی دەست بە ڕوویەوە بنێ ، گوتی :«برسیمان نی‌یە ، چ ناخۆین ! » بـەڵام شوانەکە پێی داگرت کـە دەبێ هـەر نمەکی بکەنو ئەو پەندە عارەبی‌یەی بۆ هێنان کە دەڵێ :

« ئەوەی بچێتە میوانداری یەکێكو هیچی لـە کن نەخوا وەکو ئەوە وایە چووبێتە میوانداری مردوویەك » • ئینجا گوتی : « منیش ساغو سەلامەتم ، ڕازی نیم بە مردووم دابنێن • تا نانم کەل نەکەن نابێ بڕۆن » •

سولتان ئەم قسەیەی شوانی زۆر بـە دڵ بوو ، نانو شیرەکەی

قبووڵ کرد • سیسۆ توێشەرەی کـەوڵی پشتی دانـاو کۆتکێکـی لێ دەرهێناو چوو هەندێ مەڕی دۆشیو شیرو نانی خستە بەر میوانەکانی• سولتانو لالە یەکەو قیچیان خوارد • پاشان شوانەکە لە دەروێشەکانی پرسی داخۆ ماڵیان لـە قوستەنتینەیە ؟ سولتان موراد وەڵامی دایـەوە : « بەڵێ ، ماڵمان لە پێتەختە ، شوانەکـە ، توخوا ئەگـەر هاتیتـە شار سەرێکم لێبدە ! » شوان لـە سولتان موورادی پرسی : « ئاخر ناوت چی‌یەو ماڵتان لە کوێیە ؟ » جەنابی سولتان وەڵامی دایەوە ، گوتی : « ناوم بابـە موورادەو ماڵمان لە نزیك کۆشکی سولتانە ، وەرە ئەوێ دەمدۆزیتەوە » •

بەم جۆرە هـەردوو دەروێش ماڵاوایی‌یان لـە شوانەکـە کردو گەڕانەوە ئەستەمبۆڵ بۆ بارەگای شاهانە • پاشا پیاوێکی لەو ناوە داناو تێی گەیاند کە شوانێکی لەم حاڵەو لەم ڕەنگە هەیە ،بەرگی کەوڵەبزنەو دێتە ئەو ناوە ، کە هات خۆی لێبکاتە ساحێبو پێی بڵێ کـە پیاوی ماڵی بابە موورادەو بیبـاتە ژوورێکی تایبـەتی‌و ئینجـا خـەبەر بداتە سولتان کە شوانەکە هاتوە •

پاش دوو سێ ڕۆژ ، شوانەکە دوو سێ مەڕی بژاردەو قـەڵەوی کرتو وەپێش خۆی‌دان و چوە ناو شاری ئەستەمبۆڵو لە ماڵی بابـە موورادی پرسی • هـەر کەسێ چاوی پێ دەکەوت ، پێی‌پێ‌دەکەنی و گاڵتەی پێ دەکرد تا گەیشتە نزیك کۆشکی سولتان • ئەو کابرایەی سولتان لەوێ کردبوویە سایەدی شوانەکـە بە پیری‌یەوە چووو لێی پرسی : « ها ، کێت دەوێ ؟ » شوانەکە وەڵامی دایەوە : « دەروێش بابە موورادی برادەری دڵسۆزم دەوێ • ئـەم مـەڕانـەم بـە دیاری‌و نیشانەی دۆستایەتی بۆ هێنـاوە » • کابرا گوتی من پیاوی ماڵی بابـە

مورادم ، فەرمووو با بچینە ماڵی ئاغام • شوانەکە مەڕەکانی دایەو بـە کەڵی کەوت • پیاو کە تەماشای دەکرد ، بەو کەوڵە بزنەی کردبوویە بەرو مووەکانی زیك ببوونەوە ، لێیدەترسا • بەو بـەرگەوە بردیانە ناو ژوورێکی ڕازاوە • پێڵاوی لـەپێکردەوەو دانیشت • کابرا چوو سولتانی ئاگادار کردەوە کە شوانەکە هاتووەو بە پێی فـەرمانی خۆی ردوویەتی‌یـە ئـەو ژوورەی بۆی تـەرخـان کـرابووو چـاوەڕێی فەرمانی‌ترە • سولتان‌و لالـە دیسان بەرگی دەروێشی‌یان کردە بـەرو هـەردووکیان چوونە ئـەو ژوورەی شوانەکـەی لێبوو ، گوتیـان : «سەلاموعەلێك» • شوانە هێشتا نەیدەزانی لە حوزوور سولتان دایە • پاشا فەرمانی دا « فنجانە ـ findjane »[19] قاوەیەکی خـەستی‌یان بۆ هێنا • شوانەکـە هاواری کرد : « کاکە[20] ، ئەوە شیری تۆ بۆ وا ڕەش‌و تاڵە ؟ کۆتکەکەت بۆ هـەندە بچووکە ؟ ئـەم شیرەم پـێ ناخورێتەوە ، دەمم دەسووتێ • کۆتکەکەی خۆمم بۆ پڕ بکەن ، نانی تێدەکوشم‌و ئینجا دەیخۆم » • سولتان زەردەی هاتێ‌و فەرمانی‌دا جزووی قاوەیان هێناو کۆتکی سیسۆی شوانیان پڕ قاوە کرد • پارچە نانێکیان بۆ هێناو کەوتە سەرێ بە کەوچکان خواردی • ئینجـا ڕووی کرد سولتان‌و گوتی : « کاکە ، بەخوا شیرەکەت خراپە ، زۆر تاڵـە » • ئینجا تەماشایەکی کوشین‌و مـافووورە زێڕچنـەکانی کرد کە ژوورییان پێڕازابوەوە ، وای زانی شتی ساکارو ئاساییین ، گوتی : « کاکـە ، هەندێ کەل‌وپەلی وایش بۆ من بکڕە ، بۆ منداڵان ، کـە مەڕەکانم

---

(١٩) فنجانی قاوەی تورکی‌یە • هـەر چـەندە لـە مێژە قـاوە لـە کوردستاندا هەیە ، کوردی کۆچەری کەم دەیخۆنەوەو تا ئەمڕۆش هەندێ شوان چاویان پێ نەکەوتوە •

(٢٠) کورد بە زۆری بەم ووشەیە قسە لەگەڵ یەك دەکەن •

فرۆت پارەکـەت دەدەمـەوە » • سـولتـان وەڵامـی دایـەوە : « سەرچاو ! » •

سیسۆ تەماشای شتە ئەشخەو نایابەکانی ژوورەوەی کرد ، لـە ئەرەستە جوانەکان راماو ڕووی کردەوە سولتانو گوتی : « کاکە ، کێ ئەم خانوەی بۆ دروست کردووی ، هەڵبەت میراتی باوکتـە بۆت ماوەتەوە ! » سـولتان وەڵامی دایـەوە ، گوتـی : « بـەڵێ ، میرانی باوکمە ! » سیسۆ سەری باداو گوتی : « دەمزانی ، نابێ ئەمە موڵكو ماڵی بابایەکی دەروێش بێ » •

پاش بەینێ ، خاتری خواست بڕوا چونکە مەڕەکانی بێ خودان بەجێ هێشتبوو • سولتان نۆکەرەکەی تێگەیاند پیاوێك بنێرێ چاوی لە مەڕەکان بێو بیانفرۆشێ • ئینجـا بە شـوانەکەی گوت : « لێناگەڕێم بڕۆی » • سولتان فەرمانیدا سیسۆیان بردە حەمامو بەرگێکی شاهانەیان دایە ، تەنیا ئەو حەلە سیسۆ تێگەیشت کە بابە موراد خۆی سولتانە • کە بردیانەوە حوزوور سولتان ، سیسۆ بەسەر پێی داکەوتو تکای کرد بیبوورێ کە بێ شەرمی کردوەو قسـەی نابەجێی لـە حوزوور پاشادا کردوە • سولتـان موراد سـامانو خـەڵاتێکی زۆری بـە سیسۆ بەخشی • مەڕەکەی بۆ فرۆتو زۆر دیاری پێبەخشیو پشانیش موڵکی زۆر گوندی ناوچەی بایەزیدی بە « بەرات ـ barat »[21] پـێ کەرەم کرد • سەرۆکەکانی ئەمرۆی خێڵی بەروکان لە بنەماڵەی ئەم کابرایەنو لە گوندی «گربەران»[22]دا دەژین •

× × ×

---

(٢٠) ووشەیەکی تورکییە بەرامبەر بە «فەرمانی شاهانە» بەکار دێ •
(٢١) لە بەینی بایەزیدو ماکۆیە •

کوردیش وەکو تورکەکان نەسرەدین خۆجەی ئیمامی نوکتەچی تیموری تەتەر دەکەنە پاڵەوانی زوربەی چیرۆکە کۆمێدیو گاڵەچی‌یەکانیان • هەندێ لەو چیرۆکانە وەکو چیرۆکی ناو تورکەکان بەڵام گومانی تێدا نی‌یە کە زۆریان لە کۆتایی سەدەی چواردەم یان لە سەرەتای سەدەی پازدەم کۆنترن کە سەردەمی ئەم حەکیمە ڕۆژەلاتی‌یەیە • مۆرکی ئەم چیرۆکانە زۆر لێك جودان • بۆ نموونە لە هەندێ چیرۆکدا خۆجە بە توندی لۆمەی پیاوی چڵیس دەکا ، لە هەندێ چیرۆکی‌تردا پەندی چاوەدێری گشتیمان فێر دەکا ، لە زۆربەی چیرۆکەکاندا گاڵتەچی‌یەو بەس ، لە هەندێکی‌تردا شەرەفو سەربەرزی خۆجە لە گومانەوە دووره • هەر چۆن بێ زۆربەی هەرە زۆری چیرۆکەکان لە ژێرەوە گاڵتەجاڕینو ئەو ووشەبازی‌یە ڕۆژلاتی‌یەی مەراقیانەو بە تایبەتی لە زمانی تورکی‌دا خۆش دێ ، زۆر باوە ، بەڵام کە وەری‌بگێڕیتە سەر زمانێکی‌تر ئەو تاموبۆیەی نامێنێو ئەستەمە بتوانی وەکو خۆی وەری بگێڕی •

## بەزمی قازان*

ڕۆژێ ، خۆجە «قازان – **Kasan** »ێکی لە درواسی‌کەی خواست • ئەم دراوسێیەی پیاوێکی باش نەبووو خۆجە حەزی لە چارەی نەدەکرد • چەند ڕۆژێ قازانەکەی لای خۆی گل دایەوە •خاوەنەکەی تەنگاو بوو • هاتە ماڵی خۆجەو داوای قازانی خۆی کردەوە •خۆجە قازانێکی بچووکی خستە ناو قازانی دراوسێ‌کەیو هەردووکی لە

---

* قازان : مەنجەڵ • (وەرگێڕ) •

دەست نا • کاتێ کە خاوەنی قازانەکــە ئەمــەی بینی بــە نەسرەدینی گوت : « ئەم قازانە بچووکەی ناوەوە هی من نی‌یە » • خۆجە وەڵامی دایەوە : « با هی خۆتــە ، قازانەکــەت زاوەو ئــەم بێچوەی هێنــاوە ، هەردووکیان هی خۆتن بیانبە ، من چاوم لە ماڵی تۆ نی‌یە » •خاوەنی قازانەکە زۆری کەیف پێ‌هاتو هاواری کرد :

« ئەللا کەریم – Alla Karim» چ لــە خوای عاسێ نابــێ • قازانەکانی وەرگرتو بردی‌و ڕۆیشت •

پاش دوو مانگ خۆجە دیســان چوە لای دراوسێ‌کەی‌و قازانی لێ‌خواست • ئەمجارەیان کابرا کیهە قازانی گەورە بوو لە ماڵەوە بۆی هێنا • نەسرەدین گوتی : « ئەم قازانە زۆر زلــە » • دراوسێ‌کــەی گوتی : « لەوە بچووکترم نی‌یە بتدەمێ ، قەیدی نی‌یە باشە ، ببیە ، بەڵکو خوا بکا ئەمــەیشیان بزێ ، ئــەگــەر بزێ هــەڵبەت بێچوێکی گەورەی دەبێ » • خۆجە قازانەکەی وەرگرتو بردی‌یەوەو وەســەر ئاگــری نا • قازانــەکــەی لای خــۆی گــل‌دایــەوە • پــاش مانگێك ، شتێکی وا ، خاوەنەکەی هات داوای قازانی کردەوە • خۆجە کــە چاوی بــە کابرا کــەوت کــەوتە گریان‌و ڕۆڕۆ : « ــ ئامان ، Aman“ چ دەردو بەڵایەکمان تووش هات • قازان ، ئەو قازانــە نازدارە ، مرد •• برام ، هەر خۆت سەلامەت بی » • دراوسێ‌کەی بە درندۆگی‌یەوە گوتی : « کورە کابرا ، قازان چۆن دەمرێ ؟ خۆجە ، ئەوە تۆ گاڵتەم پێ‌دەکەی ؟ » خۆجە وەڵامی دایەوە : « جەرگم ، کە جاری پێشوو گوتم قازانەکەت زاوەو بێچوێکی بوە گوتت چ لە خوای عاســێ نابــێ ، ئێستا کــە دەڵێــم قازانــەکــەت مردوە دەڵێی گاڵتــەم پێ‌دەکەی ؟! » •

× × ×

# نەسرەدین‌و دەرۆزەکەر

ڕۆژێ ، خۆجە چوە سەربان بۆ ئەوەی بانەکەی بپەستێتەوە لەو حانەدا لە دەرگەی حەوشە درا • ژنی خۆجە دەرگای کردەوە ، بینی کابرایەکی بێگانەیە ، گوتی : « فەرموو ، چیت دەوێ ؟ » کابرا گوتی : « بە خۆجە بڵێ بانگت دەکەن ! » ژنی خۆجە وەڵامی دایەوە : « ئاخر لەسەر بانەو خەریکی ئیشە » • کابرا گوتی : « قەیدی نی‌یە ، پێی بڵێ خێرا بێ » •

جا ژنە لە خوارەوەڕا بانگی خۆجەی کرد : « ئەفەندی ، کابرایەك لەبەر دەرگایە تۆی دەوێ ، دەڵێ خێرا بێ » • خۆجە گوتی : « هەزار پایە سەرکەوتووم تا گەیشتوومەتە سەربان ، بە کابرا بڵێ بزانە چی دەوێ ، خۆت وەرە پێم بڵێ » • بەڵام کابرا سووڕ بوو کە هەر دەبێ خۆجە خۆی بێتە خوارەوە ، ژنە چوو دیسان بانگی کرد • خۆجە کە دیتی کابرا هێندە سوورە لە دڵی خۆیدا گوتی : « دیارە ئیشێکی گرنگی هەیە ، وا چاکە بچمە خوارەوە » • بە هەڵەداوان لە قادرمە دابەزی ، لە تەنگاویان کەوت‌و زۆر ئازاری دی ، کاتێ بە پەستی گەیشتە بەر دەرگا تەماشای کرد دەرۆزەکەرە ، دەرۆزەکەر گوتی : « لە ڕێ خوا قرۆشێکم بدێ » • خۆجە وەڵامی دایەوە : « شوێنم کەوە » • کابرای بۆ سەربان برد • کە چل پایە سەرکەوتن خۆجە ئاوڕی لە دەرۆزەکەرەکە دایەوەو گوتی : « بڕۆ ، خوا بتدانێ »(۲۲) دەرۆزەکەرەکە منگاندی : « لە خوارێ وات گوتبا » • خۆجە وەڵامی دایەوە : « کابرا ، تۆ هەزار پایە منت دابەزاندو لە

---

(۲۲) لە ڕۆژهەڵات کە خێر بە دەرۆزەکەرێ نەکەن وای پێ دەڵێن •

دابەزیندا کەوتمو ئازارم خوارد ، هەر بۆ ئەوەی بلێی فرۆشێکم پێ کەرەم کە ، من تەنیا چل پایە تۆم هێناو وا پێت دەڵێم : حوا بتداتێ » •

× × ×

## نەسرەدین خۆجەو مەیتەکە

ڕۆژێ ، خۆجە لە ماڵەوە بوو شمەکی خۆی دەشووشت • کابرایەك هات ، داوای لێکرد مەیتێك هەیە بچێ بیشوا بۆ ئەوەی بە خاکی بسپێرن • خۆجە وەڵامی دایەوە : « ئێشم هەیە • شمەکم دەشۆم • بڕۆ مەیتەکە بێنە بیخە سەر ئەم تەختەدارە لێرە دەیشووم ، ئاوی گەرمم زۆرە • کە شووشتم ئەو حەلە بیە ، بینێژە » • کابرا گوتی : « زۆر باشە » •

کابرا چوو مەیتەکەی هێنا ، خۆجە مەیتەکەی لەسەر تەختەدارەکە درێژکردو ئەو خەڵکەی دەرکردە دەرەوە کە لەگەڵ مەیتەکە هاتبوون، گوتی : « ئێوە بڕۆنە دەرەوە ، نابێ کەس لێرە بمێنێ تەنانەت ژنەکەیشم دەبێ بچێتە دەرەوە ، من خۆم بە تەنێ مەیتەکە دەشۆم » •

زەلامەکان چوونە دەرەوە • خۆجە دەرگای کلیلداو کەوتە بیرکردنەوە ، لە دڵی خۆیدا گوتی : « من ئاوم بۆ شمەك شووشتن گەرم کردوە ، مخابنە لەو مەیتە سەرفی بکەم » •

جۆگایەکی بچووك بە بن ماڵی خۆجەدا دەهات • خۆجە بڕیاریدا مەیتەکە نەشوا ، فڕێی بداتە ناو ئەو جۆگایەوە • لنگی مەیتی ئاوساوی گرتو فڕێی دایە ناو جۆگاکە • جۆگا ڕایپێچاو بردی • خۆجە لە دڵی خۆیدا گوتی : « جا با زەلامەکان تەفرە بدەم » •

دەرکای کردەوەو گوتی : « ئەو مردوە ، ژیانی چۆن بردۆتە سەر ؟ » هەموو وەلامیان دایەوە : « فێلبازو دزو ساختەچی بوو » • خۆجە گوتی : « نەخێر نابێ وابێ • ئێوە سەهوون • دەبێ پیاوێکی باش بووبێ • چونکە هەر هێندە خستمە سەر تاتەشۆر چاوی کردەوەو نیت بوەوە ، کە ئەو قیت بوەوە زنجیرێکی زیو لە ئاسمان هاتە خوارەوەو فریشتە بەو زنجیرە هەڵیانکێشایە ئاسمان‌و گوتیان : « ئەمە پیاوی باشە ! » •

گوندی‌یە ساویلکەکان بڕوایان بە قسەی خۆجە کردو لە دلەوە گوتیان : « کاری خوایە ، هەموو شت دەبێ » و پەرتەیان لێ‌کرد ، بەرەو ماڵ بوونەوە •

دوای سێ چوار ڕۆژ مەیتەکە لە خوارەوەی ڕووبارەکە لە چلی شۆڕی دەرختێك جەڕاو دەشتەکی چاویان پێ‌کەوت • جوتیارێ چوە لای خۆجەو سەرکۆنەی کردو گوتی : « خۆجە ، تۆ بە ئێمەت گوت کابرای مردوویان هەڵکێشاوەتە ئاسمان کەچی مەیتەکەی وا لەو خوارە لە ناو ڕووبار دۆزراوەتەوەو هەموو ئاوساوە » •

خۆجە وەلامی دایەوە : « دیارە لە ئاسمان فڕێیان داوەتە خوارێ • خۆتان گوتتان کابرایەکی دزو فێلبازو ساختەچی بوە • کێ دەڵێ لە ئاسمانیش ئیشی وای نەکردوە ؟ لەوانەیە شتێکی دزی بێ بۆیە فڕێیان داوەتە خوارەوە • خێرا بڕۆ بینێژە ، تا زیندوو نەبۆتەوەو دزی لە تۆش نەکردوە » •

× × ×

# خۆجە لێفەکەی چۆن لە دەست چوو

شەوێکی زستان ، خۆجەو ژنەکەی لە شیرین خەودا بوون ، لە دەرەوە ، لە ژێر پەنجەرە ، دوو کەس لێیان بوو بە شەڕو هەرا ، چەقۆیان لێک‌هەڵکێشاو وەخت بوو ئیشەکە گەورە بێ • لەم هەراو هۆریایە ،ژنی خۆجە بە خەبەر هات‌و چوولە پەنجەرەوە تەماشای کرد، کە دیتی شەڕە ، مێردی هەستاندو گوتی : « وای خوایە لە گەورەیی تۆ ! پیاوەکە هەستە بڕۆ لێکیان بکەوە ، یەکدی هەڵدەدڕن » • خۆجە بە خەوالوویی وەڵامی دایەوە : « حورمێ ، گیانەکەم ، وەرەوە ناو جێی خۆت ، بۆ خۆت بخەوە باشترە ، بە ئیمانم ئەم دونیایە پیاوی تێدا نی‌یە • وازم لێبێنە با سەرم ڕەحەت بێ • سەرم نایەشێ بۆ پریاسکەی لێ‌ببەستم • ئێستا بچمە دەرەوە چی‌یان پێ چ نی‌یە تیرو پڕم لێبدەن » •

ژنی خۆجە ژنێکی مەکرۆ بوو • بەسەر دەست‌و پێی مێردی داکەوت • خۆجە لێی تووڕە بووو ڕکێ خۆی لێ‌کردەوە بەڵام لە ئەنجامدا دڵی نەرم بوو ، لێفەی لە خۆی پێچاو لە قادرمە دابەزیو چوە شوێنی هەراکەو پێی گوتن : « کوڕم ، بکەنە خاتری ئەم ڕیشە سپی‌یەی من واز لەم شەڕە بێنن » • کابراکان خۆیان تێ‌ڕوو کردو لێفیان لە شانی خۆجە داپچڕی‌و هەڵاتن بردیان • خۆجە گوتی : « زۆر باش بوو ! » چوەوە ژووری‌و دەرگای گاوەدا • ژنەکەی گوتی: « چا بوو چووی ، لێکت‌کردنەوە • شەڕەکەیان بە تاڵ کرد؟» • خۆجە وەڵامی دایەوە : « ئا ، شەڕیان بەتاڵ کرد » •

– خۆجە ، ئەوە لەسەر چ بەشەڕ هاتبوون ؟

خۆجە وەڵامی دایەوە : « شێتە ، لەسەر لێفەکەی من شەڕیان بوو . لەمەو دوا ئەمە دەکەمە دروشمی خۆم : ووریەی ماران بە » .

**– تەواو –**



**تێبینی :**

- سوپاس بۆ کاك زادە کەبەرگەکەی بۆ نووسیم .
- سوپاس بۆ کاك حسێن عەلی وەلی کە کتێبە ئینگلیزی‌یەکەی لە کتێبخانەی مەرکەزی زانکۆی مووسل بۆ دەستنیشان کردم .

رقم الايداع في المكتبة الوطنية ببغداد ١١٣٤ لسنة ١٩٨٣

La Femme Kurde En Turquie

**Par:**

Lucy. M. J. Garnett

Traduit de L'anglais en Kurde

**Par:**

Aziz Gardi

---

# المرأة الكردية في تركيـا

**تاليف : لوسى گارنيت**

**ترجمه من الانكليزية**

**عزيز گردى**

---

**نرخى (٧٥٠) فلسه**